


# کۆمەڵگەی ڕەش

د. عادل باخەوان






د. عادل باخەوان

# کۆمەڵگەی ڕەش

ناوی کتێب: کۆمەڵگەی ڕەش

ناوی نوسەر: د. عادل باخەوان

بابەت: توێژینەوە

دیزاینی بەرگ: ناوەندی دیزاینی ئەندێشە-باسم ڕەسام

دیزاینی تێکست: ناوەندی دیزاینی ئەندێشە-دانا حەسەن

نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٣

چاپخانە: کارۆ/سلێمانی

تیراژ: (٢٥٠٠) دانە

نرخ: (٦٠٠٠) دینار

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە (١٦٨٩)ـی ساڵی (٢٠١٣)ـی پێدراوە

ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە/ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

سلێمانی-شەقامی مەولەوی-تەلاری سیروانی نوێ-نهۆمی چوارەم

www.endeshe.org ● andesha.library@yahoo.com

http//www.facebook.com/Andeshacenter

07501026400

# تابلۆی بابەتەکان

سەرەتا ........................................ ١١

بەشی یەکەم: دیموکراسی و بەرهەمهێنانی مۆدێلەکانی بێ متمانەیی ............ ١٧

١. کۆمەڵگەی بێ-متمانە .......................... ١٨

٢. بۆئەوەی دیموکراسی هیتلەر دروستنەکاتەوە ................ ٥٩

بەشی دووەم: چاودێریکردنی دیموکراسی ............... ٨١

١. هاوڵاتی وریا ........................ ٨٧

٢. هاوڵاتی ڕەخنەگر ........................ ١٠٥

٣. هاوڵاتی نمرەبەخش ........................ ١١٧

بەشی سێیەم: کێن ئەوانەی چاودێریی دیموکراسی دەکەن؟ ........... ١٢٣

١. بزوتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان ................ ١٢٧

٢. تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی سەر ئینتەرنێت ............... ١٤٣

٣. گروپی تایبەتمەندە جیاوازەکان ................ ١٥٧

کۆتایی ........................................ ١٦٣

# پێشکەشکردن

ئەم کتێبەم پێشکەشە بە «ئەنەتا»ی کچم، کە ئێستا تەمەنی بیست مانگە. بەشێکی زۆر لەو کاتانەی کە دەبوو بۆ ئەوم تەرخانبکردایە، ئەم کتێبە بردی. ئومێدەوارم کاتێک گەورەدەبێت و دەیخوێنێتەوە لێمببورێت.

## سوپاس

بە درێژای ئەم توێژینەوەیە چەندین کەس و دەزگا و هەریەکێک لە ئاستی خۆیدا هاوکاریانکردووم و لەساتەوەختی بڵاوکردنەوەیدا دەبێت بەلای کەمەوە ناویان بێنم:

بە گەرمی سوپاس بۆ کاک جەزا حەمەصالح والی، سەرۆکی کۆمەڵەی کۆمەڵناسان و دەروونناسانی کوردستان و سەرپەرشتیاری کارگێڕی توێژینەوەی پەیوەندی نەوەی نوێی کوردستان بە کێڵگەی سیاسی کوردییەوە، سوپاس بۆ هەموو ئەو خوشک و برا توێژەرانەی کۆمەڵە کە بە کۆکردنەوەی داتاکانەوە ماندووبوون و لە م توێژینەوەیەدا بەشداربوون. دڵنیابن کە ئێوە لە یادەوەری ئەم کتێبەدان. ئەم کتێبە قەرزاری ئەو توێژینەوە مەیدانییەیە کە ساڵی ٢٠٠٨ لە ژێر سەرپەرشتی زانستی مندا، کۆمەڵە ئەنجامیدا. ئەم توێژینەوەیە کە زیاتر لە هەزار لاپەڕە چاوپێکەوتنی تاکە کەسی و پاشان لەڕێگای فۆڕمی ڕاپرسییەوە زیاتر لە پێنج هەزار تاکی کوردی دواندووە، یەکێکە لە سەرچاوە بەهێزەکانی ئەم کتێبە و بەشێکی زۆر لە داتاکان لەو توێژینەوەیەوە وەرگیراوون و بەوردی ڕاڤەکراون.

سوپاسی بێ سنورم بۆ مامۆستا ئیبراهیم مەلا زادە و هاوڕێکانی کە بۆ بەدیهێنانی توێژینەوەیەکی مەیدانی لەسەر بەشێک لە کوردەکانی بەریتانیا هاوکاریانکردم. بەبێ ئەوان ئەو توێژینەوە مەیدانییە نەدەکرا و لەم کتێبەشدا نەدەتوانرا سودی لێوەربگیرێت.

هەروەها سوپاسی برا و دۆستی نزیکم کاک ئازاد بەرزنجی دەکەم، کە لەڕێگای ئەلیکترۆنییەوە سەرچاوەیەکی بۆدابینکردم. بێگومان بەبێ هاوکاری ئەو، دەستم لەو سەرچاوەیە گیرنەدەبوو. ماندووبوونی کاک ئازاد بە کێڵگەی ڕۆشنبیریی کوردییەوە دیاردە و جێگای ڕێزی هەموو لایەکمانە.

لە کۆتاییدا دەبێت سوپاسی کاک هەژار و ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە بکەم، کە هەر لەسەرەتای ئەم پرۆژەیەوە ئامادەییخۆیان بۆ هەموو پشتیوانییەکان دەربڕیوە. پشتیوانی ئەندێشە لەم پرۆژەیە یەکێکە لەو هۆکارانەی کە هەلومەرجی تەواوبوونیان ڕەخساند.

# پێش خوێندنەوە

کۆمەڵگەی مەدەنی دەنگدەر، دەتوانێت چیبکات بۆئەوەی کە ئەکتەرە سیاسییە دەنگپێدراوەکانی ئەمڕۆ، لە سبەینێیەکی نزیکدا، نەبنەوە بە ئەکتەرە سیاسییە گەندەڵ و گومڕاکانی دوێنێ؟، دەتوانێت چیبکات بۆئەوەی ئەکتەرە سیاسییە دەنگپێدراوەکانی ئەمڕۆ، لە سبەینێیەکی نزیکدا، نەبن بە توێژێکی ئەرستۆکراتی لەخۆگۆڕاوی بێ یادەوەری و بێ هەست؟.

کە هەموو بڕیارە چارەنوسسازەکانی ئەندامانی کۆمەڵگەیەک (بڕیاری دەسەڵاتی کڕین، بڕیاری جەنگ و ئاشتی، بڕیاری دۆزینەوە یان لەدەستدانی کار، بڕیاری گەشەکردن یان قەیران، بڕیاری دادپەروەری یان ستەمکاری،...) لەدەستی سەرۆکێک، سەرۆک وەزیرانێک و چەند وەزیرێک یان چەند ئەندامێکی پەرلەماندا بێت، کۆمەڵگەی مەدەنی دەتوانێت چیبکات بۆئەوەی ئەم نوخبەیە پارێزراوبن لەوەی کە یاری بە چارەنوسی بکەن؟.

کۆمەڵگەی مەدەنی دەتوانێت چی بکات بۆئەوەی شۆڕشگێڕەکانی دوێنێ، کە بەناوی شەرعیەتی دیموکراسییەوە جەنگی مان و نەمانیان لەگەڵ دیکتاتۆریەتدا دەکرد، ئەمڕۆ کە بەڕێگای هەڵبژاردن گەشتونەتە

دەسەڵات، لە سبەینێیەکی نزیکدا، نەبنەوە هەمان ئەو دیکتاتۆرەی کە ڕووبارێک خوێنیان لەپێناوی قەڵاچۆکردنیدا بەخشی؟. چیبکرێت بۆئەوەی سبەینێیی دیموکراتێک نەبێت بە ڕەوتی بیناکردنەوەی «ئەویتری» دیکتاتۆر؟، چی ڕێگا لەوەدەگرێت کە هەڵبژێردراوێک گەندەڵترنەبێت لە خۆسەپێنەرێک؟، ئایا کردەی هەڵبژاردن بەسە بۆئەوەی کە هەڵبژێردراو ببێت بە نمونەی دەستپاکی و لێبوردەیی؟.

## سەرەتا

سەرەتاکانی سەدەی بیست و یەک شانۆی وەرگێڕانی دیاردەیەکی جیهانی وەک دیموکراسییە لە «ئیشکالیەت»ی کۆمەڵگەییەوە بۆ «بەڵگەنەویست»ی کۆمەڵگەیی؛ بەومانایەی کە لە ئێستا و ئێرەدا، جگە لە چەند ئەکتەرێکی سیاسی پەراوێزخراو، گروپێکی کۆمەڵایەتی، حیزبێکی سیاسی، تەنانەت ڕژێمە سوڵتەوییەکانیش خۆیان وەک دیموکرات پێناسەدەکەن، وەک ئەوەی چیتر نا-دیموکراسی ئەو ڕووبەرە ناشیرینە بێت کە کەس نەیەوێت تیایدا نیشتەجێبێت. لە هەمانکاتدا و لەپەنای ئەم «بەڵگەنەویستە»دا (دیموکراسی وەک دیاردەی جیهانی)، دیاردەیەکی دیکەی جیهانی بەڕێوەیە و لە ساتەوەختی خۆ وەرگێڕانەدایە بۆ «بەڵگەنەویستی» دووەم؛ کە دەکرێت ناویبنێین ڕەخنە لە دیموکراسی، گرفتەکانی دیموکراسی، لەدەستدانەکانی دیموکراسی، تراژیدیاکانی دیموکراسی یان بۆشاییەکانی دیموکراسی. ئەم دوو دیاردەیە وەک دوو ڕووبەری ناحەز بەڵام تێکەڵبەیەک، وەک دوو جەستەی دژ بەڵام ئاوێزان لە ماڵێکدا دەژین کە پێی دەوترێت کۆمەڵگە.

لەدەرەنجامی بەریەککەوتنی ئەم دوو دیاردەیەدا شتێکی سێیەم دروستدەبێت، کە بابەتی سەرەکی ئەم توێژینەوەیەی ئێمەیە و،

ناویدەنێین «کۆمەڵگەی بێ-متمانە!»، بێ-متمانەیی کۆمەڵگە لە بەرامبەر ڕژێمە دیموکراتەکاندا، لە بەرامبەر دەرئەنجامەکانی دیموکراسیدا، لەبەرامبەر ئەکتەرەکانی دیموکراسیدا، لەبەرامبەر هەموو ئەوانەی کە دیموکراسی دەیانخاتە سەر شانۆ و پاشان وەک «نوخبەیەکی» هەمیشەیی خۆیان لە ژیانی ئاسایی کۆمەڵگە جیادەکەنەوە. ئیشکالیەتی سەرەکی ئەم توێژینەوەیە بریتیە لە گەڕان بەدوای تێگەشتن لە چۆنیەتی بیناکردنی ئەم «بێ-متمانەییەی کۆمەڵگە» لەبەرامبەر هەموو دیموکراسی و هەموو ئەوانەشدا کە بەناوی ئەوەوە قسەدەکەن و شەرعیەت بە ئامادەبوونیان لە ناوچەکانی دەسەڵاتدا دەبەخشن.

چی وادەکات هاوڵاتیان تا ئاستێکی ترسناک ڕقیان لە سیاسییەکان بێت؟، چی وادەکات یادەوەری هاوڵاتیان هەمیشە سەرگەرمی کێشانی ناشیرینترین وێنەی سیاسییەکان بێت؟، چی وادەکات لەوەی هاوڵاتیان گومانیان لە هەموو شتێکی ئەم نوخبەیە بێت، هەر بە ستراکتۆری عەقڵیانەوە تا دەگاتە جوڵانەوەکانیان لە ژیانی هەموو ڕۆژێکیاندا؟، گومان لە خانوەکانیان، لە ئۆتۆمۆبیلەکانیان، لە پارێزەرەکانیان، لە بەڕێوەبردنیان، لە گەشتەکانیان، لە پێکەنینەکانیان، لە گریانیان، تەنانەت لە ژیانی شەخسیشیان؟ کامانەن ئەو میکانیزمانەی کە دەکرێت گەمارۆی ئەم بێ-متمانەیيە بدەن و مەودای نێوان کۆمەڵگە و نوخبەی سیاسی کەمبکەنەوە؟. چۆن و بەچ ڕێگایەک کۆمەڵگە دەتوانێت دەسەڵاتی نوخبەی سیاسی سنورداربکات و ڕێگاکانی لادان «ئینحراف»ی لێبگرێت؟، لە ئامادەنەبوونی ئەم میکانیزمانەدا، ئایا تاچەند «ڕقێکی ڕەشی کۆمەڵگەیی» لە دیموکراسی وەک گریمانەیەکی بەهێز، هەلومەرجی بابەتییانەی لەدایکبوون و گەشەکردنی ئامادەدەکرێت؟.

دیموکراسی مۆدێرن، هەر لە سەرەتای سەرەتاکانەوە، لەیەک کاتدا خۆی وەک «بەڵێن» و «گرفت» خستوەتە سەر شانۆ[1]. بەڵێنی ڕژێمێک کە وەڵامی تەندروستانەی پێداویستییەکانی کۆمەڵگە دەداتەوە، هەروەها گرفتی هەمان ئەو ڕژێمە و دەستەوستانی لە بەرامبەر واقیعی سەختی کۆمەڵایەتی چین و توێژەکاندا. دەستەوستان لەبەرامبەر واقیعێکی تاڵی کۆمەڵگەییدا کە هەلومەرجی بەدیهێنانی ئایدیالەکانی دیموکراسی ئامادە ناکات. لە ١ ی مایسی ١٦٤٩ دا، دۆکۆمێنتێک لە لەندەن بەناوی «ڕێکەوتنی گەل» بڵاودەبێتەوە. ئەم دۆکۆمێنتە وەک یەکەم مانیفێستی دیموکراسی نوێ تەماشادەکرێت. کۆی ناوەڕۆکەکەی کلیککردنە لەسەر دوالیزمی بەڵێن و گرفتەکانی دیموکراسی. بەڵێنەکان بریتین لە:

- ✓ گرەنتی ئازادییە مەدەنی و ئاینییەکان.
- ✓ پێکهێنانی دەزگای دادوەری سەربەخۆ.
- ✓ سیستەمی هەڵبژاردن و دەنگدان.
- ✓ سنوردانان بۆ دەورەکانی دەسەڵاتداری.
- ✓ مافی هاوڵاتیان بۆ بەدەستهێنانی بەرزترین وەزیفەی حکومی.
- ✓ یەکسانی هاوڵاتیان لەبەرامبەر چانسەکاندا.

بەڵام لەهەمانکاتدا ئەم دۆکۆمێنتە کلیک لەسەر گرفتەکانی دیموکراسیش دەکات:

- ✓ کردنەوەی دەرگا لەسەر گەندەڵی.
- ✓ خۆ فەرزکردنی بەرژەوەندییە تایبەتەکان.

---

[1] Pierre Rosanvallon, *La contre-démocratie. la politique à l'âge de la défiance*, Seuil, Paris, 2006, p.10.

✓ سەرهەڵدانی بێ-متمانەیی لەنێوان کۆمەڵگە و نوخبەی دەسەڵاتدا.

٣٦٢ ساڵ پاش بڵاوبونەوەی «ڕێکەوتنی گەل[٢]»، بەڵێن و گرفتەکانی دیموکراسی سەدان توێژەر، لە سەدان کۆمەڵگەی جیاوازدا ناچاردەکەن بەوەی کە ڕژێمی دیموکراسی بە نوخبەکانییەوە، بە میکانیزمەکانی چاودێریکردنییەوە بپشکنین. پرۆژەیەکی لەم جۆرە، چەند بەڵگەیە لەسەر بەهێزی دیموکراسی، هێندەش بەڵگەیە لەسەر لەرزۆکی ستراکتۆرەکانی[٣]،

---

[٢] Lutaud Olivier, L'accord du peuple, Londres, 1er mai 1649. In : Annales. Economies, Sociétés, CivilisationsI, 17e année, N.3. 1962.

[٣] ستراکتۆر بریتیە لە کۆی چەند ڕەگەزێک کە پەیوەندییەکی توندوتۆڵ بەیەکەوەیان دەبەستێت و دەستکاریکردنی هەر ڕەگەزێک لەو ڕەگەزانە دەبێتە مایەی گۆڕانی ئەو چوارچێوەیەی کە کۆی ڕەگەزەکان لە خۆ دەگرێت.

بەکارهێنانی چەمکی ستراکتۆر دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەڤدە. ئەو سەردەمە زانستە فیزیکییەکان لەبری وشەی "ڕێکخراو" بەکاریان دەهێنا. لە سەدەی نۆزدەهەمەوە، زانستە کۆمەڵایەتییەکان بەکاری دەهێنن بەتایبەتی لە چرکەی بەراوردکردنی کۆمەڵگە بە جەستەیەکی زیندوودا. دواتر زانستە کۆمەڵایەتییەکان وشەی ستراکتۆر لەبری سیستەم بەکار دەهێنن. ئۆگست کۆنت کە دامەزرێنەری سۆسیۆلۆژیایە، پێیوایە کە هیچ فاکتێکی کۆمەڵایەتی بەبێ گەڕانەوە بۆ ئەو ستراکتۆرەی کە بەرهەمی دەهێنێت، تەفسیر ناکرێت. دواتر مارکس دێت و ئەم چەمکە قووڵتر دەکاتەوە، بەتایبەتی لەڕێگای جیاکردنەوەی ئانفرا-ستراکتۆر لە سوپەر-ستراکتۆر.

چەمکی ستراکتۆر ڕووناکی دەخاتە سەر ئەو سیستەمە پەیوەندییەی کە یەکەیەکی گونجاوی گونجاوکراوی گونجاوکار دروستدەکات و لەناوەوەی ئەو یەکەیەدا هیچ ڕوبەرێک بۆ ئۆتۆنۆمی ڕەگەزە پێکهێنەرەکان بوونی نییە.

بەدیوێکی دیکەدا دەتوانین بڵێین: هەر ستراکتۆرێک لە کۆمەڵێک یاساو نۆرم دروستبووە و ئەم یاساو نۆرمانەش مێژوویەکی کۆمەڵایەتییان هەیەو لە ئێستا د

کە گەر بە وشیاریەوە مامەڵەیان لەگەڵدا نەکرێت، دەکرێت تراژیدیای گەورە دروستبکەن.

---

ئێرەدا لەدایک نەبوون و تێگەشتن. بۆ تێگەشتن لەهەر ستراکتۆرێک ئێمە دەبێت بگەڕێینەوە سەر ئەو مێژووە کۆمەڵایەتییەی کە هەلومەرجی بابەتییانەی دەرکەوتنی ئەو یاساو نۆرمانەی دەستەبەر کردووە.

کاتێک لە چێشتخانەی زانکۆی سۆربۆن یان لیۆن دادەنیشیت و بەوردی سەرەنجی چۆنیەتی نانخواردنی هەر خوێندکارێک دەدەیت، لەو ستراکتۆرە کۆمەلایەتیانە تێدەگەیت کە لە پشت چۆنیەتی نانخواردنی ئەو خوێندکارانەوە کاردەکات. کاتێک سەرەنجی چۆنیەتی پێشوازیکردن لەمیوانی دوو کەسایەتی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەدەیت، تێبینی ئەو ستراکتۆرە کۆمەلایەتیە دەکەیت کە چۆنیەتی ئەو پێشوازیکردنەی هەریەکێک لەم دوو ئەکتەرە ڕێکدەخات.

# بەشی یەکەم
# دیموکراسی و بەرهەمهێنانی مۆدێلەکانی بێ متمانەیی

- یەکەم: کۆمەڵگەی بێ متمانە.
- دووەم: بۆئەوەی دیموکراسی هیتلەرێکی دیکە دروستنەکاتەوە.

## (١)
## کۆمەڵگەی بێ-متمانە

ڕەنگە جێگای پرسیاربێت کە بۆچی هەمیشە مێژووی دیموکراسی و مێژووی بزوتنەوە ناڕەزاکان، مێژووی دیموکراسی و مێژووی ناڕەزایی لکاون بەیەکەوە. لەهەر شوێنێکی دنیادا دیموکراسی هەبێت، ناڕەزاییش لەچەندین چوارچێوەی جیاوازدا خۆی مانیفێستدەکات. لە پێناوی تێگەشتن و پاشان دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو بۆ ناڕەزاییەکان، وەک پیەر ڕۆزانڤالۆن، پرۆفیسۆر لە کۆلێژی دو فرانس دەڵێت[٤]، کۆمەڵگەی دیموکرات دەتوانێت بە دوو ئاڕاستەدا کاربکات:

ئاڕاستەی بەرزکردنەوەی ئاستی کردەی هەڵبژاردن و ڕووتکردنەوەی لە هەموو تەمومژەکان، لەوەش زیاتر بەردەوامی هەڵبژاردن لە کات و شوێنی خۆیدا و گشتاندنی بەسەر هەموو خانەکانی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا. ئاڕاستەی دووەمیش بریتیە لە پێکهێنانی دەزگا، بزوتنەوە و ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەی مەدەنی، کە ڕاستەوخۆ گوزارشت لە ناڕەزاییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان دەکەن.

---

[٤] Pierre Rosanvallon, *Opus citatum*.

دوو ئاڕاستەی کارکردن لەهەمان کاتدا یەکسانە بە جیابوونەوەی دوو ڕووبەر لەیەکتری؛ ڕووبەری جوڵانەوەی دیموکراسی و بەڵێنەکانی، خەونەکانی، پرۆژەکانی، گرفتەکانی، پرسیارەکانی، قەیرانەکانی و تراژیدیاکانی لەلایەک و ڕووبەری بێ‌متمانەییش لەلایەکی دیکەوە. لە کوردستاندا، جیابوونەوەی ئەم دوو ڕووبەرە بە ئاشکرا هەستیپێدەکرێت. چەند هەڵبژاردنەکان دووبارە ببنەوە، هێندەش ئاستی بێ‌متمانەیی هاوڵاتیان بەرزتر دەبێتەوە، چەند پەرلەمان کارابکرێت، هێندەش سنوری نارەزاییەکان فراوانتر دەبن، چەند دەزگاکانی دیموکراسی بەهێزتربن، هێندەش نەوەکان بێ ئومێدتر دەبن.

لە چوارچێوەی توێژینەوەیەکی سۆسیۆلۆژیدا لەسەر پەیوەندی نەوەی نوێی کوردستان بە کێڵگەی سیاسییەوە، کە لەژێر سەرپەرشتی ئێمەدا، ساڵی ٢٠٠٨ کۆمەڵەی کۆمەڵناسان و دەروونناسانی کوردستان ئەنجامیاندا، بۆچوونی پێنج هەزار و سێسەد و شەست و شەش کەس لەسەر چەندین بابەتی گرنگی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئاینی وەرگیراون. لەسەر ئاستی داتا، ئەم توێژینەوەیە یەکێکە لە سەرچاوە گرنگەکانی ئەم کتێبە و زیادەڕەوی ناکەین گەر بڵێین یەکێکە لەو توێژینەوە هەرە گرنگ و ناوازانەی کە زۆرترین داتای بایەخدارمان لەسەر چەندین بابەت دەخاتە بەردەست*.

لە نێو کردەی پشکنینی کۆی ئەو داتایانەی کە لەم توێژینەوەیەدا سەرناو کەوتوون، بێ متمانەبوونی نەوەی نوێ لەبەرامبەر حیزبە

---

* هەر لێرەوە و لیسانەوە یەک یەک سوپاسی هەموو ئەو برا و خوشکانەی کۆمەڵەی کۆمەڵ ناساندەکەم دەکەم کە بەشداریانکرد لە بەدیهێنانی ئەم توێژینەوەیەدا.

سیاسییەکاندا یەکێکە لەو دەرئەنجامانەی کە ڕاستەوخۆ بەر هەستمان دەکەون. بێ متمانەیی لەبەرامبەر هەموو ئەو شتانەدا کە بەجۆرێک لە جۆرەکان کۆمەڵگە و تاکەکانی دەبەنەوە سەر حیزب و چوارچێوەکانی و لە هەندێک شوێنیشدا هەست بە «ڕقێکی ڕەش» بەرامبەر بە سیاسەت و سیاسی لە کوردستاندا دەکرێت.

لە کۆی ئەو پێنج هەزار و سێسەد و شەست و شەش کەسەی کە لەسەر ئاستی کوردستان بۆچونیان وەرگیراوە و سەر بە نەوەی نوێی کۆمەڵگەن، تەنها (١٤,٧٪) سەر بەیەکێک لە حیزبە عەلمانی، ئیسلامی یان کۆمۆنیستەکانن. حیزبە عەلمانییەکان، بەتایبەتی پارتی و یەکێتی، تەنها توانیویانە قەناعەت بە (٧,٨٠٪)ی ئەم نەوەیە بکەن، هەموو حیزبە ئیسلامیستەکان، یەکگرتوو و کۆمەڵ و بزوتنەوە، تەنها قەناعەتیان بە (٥,٧٠٪) کردووە. ئەم ڕێژەیە لای حیزبە کۆمۆنیستەکان دادەبەزێت بۆ (١,٢٠٪)، لای ڕێکخراوەکان بەرزدەبێتەوە بۆ (٢٣,٣٠٪). بەڵام نە حیزبە عەلمانییەکان، نە حیزبە ئیسلامیستەکان، نە کۆمۆنیستەکان و تەنانەت ڕێژەی ڕێکخراوەکانیش، کە برپیارە گوزارشت لە خەون و بەرژەوەندی نەوەی نوێ بکەن، بەهیچ شێوەیەک بەراوردناکرێت لەگەڵ ڕێژەی ئەو کەسانەی کە ئینتیمایان بۆ هیچ یەکێک لەم حیزب و ڕێکخراوانە نییە و نایانەوێت متمانەی خۆیان بەیەکێک لەم پرۆژە سیاسیانە ببەخشن. ڕێژەی بێ متمانەکان دەگاتە (٦٢٪) و بە پێی لۆژیکەکانی ستاتیستیک هەموو بەراوردەکان لنگاوقوچ دەکاتەوە. (بڕوانە گرافیکی ژمارە ١).

گرافیک ١


ئەندامی کام لەم حیزب و ڕێکخراوانەی ؟
62%
23.30%
7.80%
1.20%
5.70%
هیچیان
ڕێکخراوەکان
حیزبە ئیسلامیەکان
حیزبە کۆمۆنیستیەکان
حیزبە عەلمانیەکان

ڕەشبینی نەوەی نوێ و بێ متمانەیی لەبەرامبەر فاکتە سیاسییەکاندا، بە هەموو شێوەیەک ئەو شتە تێدەپەڕێنێت کە لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا پێیاندەوترێت دۆخی ناوازە، بەپێچەوانەوە، یەکێکە لەو دیاردە گشتگیرانەی کە بەردەوام خۆی دووبارەدەکاتەوە و لە هەموو ڕووبەرە سیاسییەکاندا کاردەکات. دەکرێت لێرەدا دیسانەوە هەڵبژاردن وەک فاکتێکی[٦] کۆمەڵایەتی/سیاسی بەهێز وەربگرین و بیخەینە هۆڵەکانی

---

[٦] ڕەگوڕیشەی ئەم کۆنسێپتە دەگەڕێتەوە سەر زمانی لاتینی کۆن، (1160) ساڵ لەمەوبەر بەوشەی (factum) فاکتیوم دەستی پێکردووە بەمانای (action humaine) و (action remarquable) هاتووە.

(تێبینی: بۆ بەکوردیکردنی وشەی "فاکت" لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی تایبەتم کە لە بواری سۆسیۆلۆژیادا دەخوێنن، لێرە لە فەرەنسا و ئەڵمانیا و بەریتانیادا قسەمکردووە و کاتێکی زۆرمان بە پشکنینی هەموو ئەو وشە کوردیانەدا بەسەر بردووە کە دەکرێت لە بری فاکت بەکاری بێنین. بەڵام هیچ یەکێک لەو وشانە توانای گەیاندنی ماناکانی فاکتیان نییە و تەنانەت زۆربەی زمانە ئەوروپییەکانیش ئەسڵە لاتینییەکەیان وەرگرتووە و بە گۆڕانی بچووکەوە دایانڕشتوەتەوە. وەک لەسەرەوە دەیبینین. دەوترێت لە کوردستاندا بە حەقیقەتی کۆمەڵایەتی تەرجەمەکراوە، ئەمە هەڵەیەکەی گەورەیە و بەهیچ شێوەیەک ئەو مانایە نادات بەدەستەوە. بۆیە ئێمە پێمان باشتربوو وشە ئینگلیزیەکە وەک خۆی بنوسینەوە و لەڕێگای ئەم ڕوونکردنەوەیەی خوارەوە خوێنەری کورد تێبگەیەنین لە ماناکانی فاکتی کۆمەڵایەتی کە لکاوە بە مێژووی سۆسیۆلۆژیاوە).

فاکتی کۆمەڵایەتی لەسەرەتاوە وەک شتێکی "بابەتی" خراوەتە نێو گەردوونی سۆسیۆلۆژیاوە و وەک بەرهەمی دامەزراندنی پەیوەندی نێوان دوو تاک یان چەند تاکێک یاخود چەند گرووپێکی کۆمەڵایەتی خراوەتە سەر شانۆ. واتە لە ڕەهەندە سایکۆلۆژی و بایۆلۆژییەکان دوورخراوەتەوە.

لێرەوە فاکتی کۆمەڵایەتی ڕاستەوخۆ دەلکێت بە جیهانی "بابەتیبوون"ەوە. ئێمە کاتێک بە شتێک دەڵێین "کردەی کۆمەڵایەتی" کە بووبێت بە واقیعێکی بەرجەستەکراو نەک خەیاڵکراو یان وەهمی. بۆنموونە ناتوانین بڵێین: کوردستان دابەشنەکراوە بەسەر ئێران و عێراق و سوریا و تورکیادا، ئەمە واقیعە نەک وەهم.

لە زانستە فیزیکییەکاندا، وشەی "فاکت" مانایەکی وردی هەیە و پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە چالاکی ئەزموونگەراییەوە هەیە، کە لەسەر بابەتگەرایی خۆی بینادەکات. لەم جیهانەدا "فاکت" تێبینی دەکرێت و پاشان دەبێت بە دەرهاویشە "داتا".

کۆنسێپتی "فاکتی کۆمەڵایەتی" ڕاستەوخۆ لکاوە بە ئیمیل دۆرکایم ەوە. بەپێی ئەو فاکتی کۆمەڵایەتی بریتیە لە بابەتی سەنترالی سۆسیۆلۆژیا. لە کتێبی «Règlees de la méthode sociologique»دا بەشێکی گرنگی تایبەتکردووە بە دیاریکردنی چوارچێوە کۆنسێپتویلەکانی فاکتی کۆمەڵایەتی، ئەو بەم شێوەیە پێناسەی دەکات:

> **" فاکتی کۆمەڵایەتی بریتیە لە هەموو ئەو شتە کۆمەڵایەتیە *دەرەکییانەی* کە کارایی دادەنێن بەسەر تاکەوە و ئاراستەکانی ڕەفتار و گوتاری بۆ دیاری دەکەن و لە کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا وەک گشتێک خۆیان دەسەپێنن بەسەر تاکەکاندا و لە هەمانکاتدا *سەربەخۆیی* خۆیان دەپارێزن. سەربەخۆ لە هەموو دەرکەوتنە تاکییەکان".**

لەم چوارچێوە فیکرییەدا، بۆنموونە پارتی دیموکراتی کوردستان، تیرۆریزم، خودکوژی، حکومەتی هەرێم، پەیوەندی نێودەوڵەتی، دەزگاکان فاکتی کۆمەڵایەتین. ڕاستە دۆرکایم وەک سەرچاوەی دامەزرێنەری ئەم کۆنسێپتە دادەنرێت، بەڵام ئەوەش ڕاستە کە هەر لە مارسێل موسەوە تا دەگاتە لوک بۆلتانسکی و ئالان تۆرین و بێرگەر و لوکمان و گارفینکێل و گۆفمان و ئەنسالم شتراوس تێگەشتنەکانی دۆرکایمیان خستوەتە ژێر پرسیارەوە:

ئایا فاکتی کۆمەڵایەتی بریتیە لە دیاردە کۆلێکتیڤەکان یان کۆی کردەکانی تاکێکە؟.

تاقیکردنەوەی بۆچونی نەوەی نوێی کوردستانەوە. یەکێک لەو پرسیارانەی کە لەم پێنج هەزار و سێسەد و شەست و شەش کەسەمان کردووە بریتیە لەمەی خوارەوە:

ئامادەیت بەشداری لە کام هەڵبژاردنەکانی داهاتوودا بکەیت؟.

هەڵبژاردنی ناوخۆی حیزبەکان تەنها پێنج لە سەد متمانەی بەشداریکردنیان بەدەستدەهێنێت و تەنها بیست لە سەدیان بەشداری هەڵبژاردنی پەرلەمان دەکەن. نەوەی نوێ بە توندی سزای ڕێکخراوەکان دەدات و تەنها نزیکەی شەش لە سەدیان متمانەیان بە هەڵبژاردنەکانیان هەیە، واتە (٩٤٪) باوەڕیان بە هەڵبژاردنەکانی ڕێکخراوەکان نییە و نایانەوێت بەشداریان تیادا بکەن. هەڵبژاردنی پارێزگاکان کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە ژیانی ڕۆژانەیانەوە هەیە و کارایی لەسەر بابەتە

---

ئایا دەکرێت لە گەردوونی زانستە کۆمەڵایەتی و مرۆییەکاندا باس لە بابەتیبوون بکەین؟ ئایا بابەتیبوون تایبەتنییە بە گەردوونی زانستە فیزیکییەکانەوە؟.

ئایا وەک چۆن فۆرمە بابەتییەکان، چوارچێوەکانی ڕەفتار و گوتاری تاک دیاری دەکەن، ئاواش تاکەکان چوارچێوەی فۆرمە بابەتییەکان دیاری ناکەن؟.

تا چ سنورێک دەتوانین باس لە دیتێرمینیزم بکەین؟ تا کوێ کردەی کۆمەڵایەتی خاوەنی" دیتێرمینیزم"ە لەبەرامەبەر تاکەکاندا؟.

دۆرکایم لەو کتێبە بەناوبانگەیدا دەڵێت: "دەبێت سۆسیۆلۆگ فاکتی کۆمەڵایەتی وەک شت تەماشابکات و کاری لەسەر بکات". واتە وەک چۆن کۆمەڵێک یاسا تەلەفزیۆنێک، ڕادیۆیەک، پەرداخێک، مێزێک بەڕێوە دەبەن، ئاواش کۆمەڵێک یاسا کردەیەکی کۆمەڵایەتی بەڕێوە دەبەن. پەنجا ساڵ دواتر سووپایەک سۆسیۆلۆگ لە دۆرکایم ڕاستدەبنەوە و پێدەڵێن: فاکتە کۆمەڵایەتییەکان شتن نین، بەڵکو بیناکردنێکی کۆمەڵایەتی بەردەوامن. سەرچاوە : عادل باخەوان، ئاین چییە؟، دەزگای سەردەم، ٢٠٠٨.

هەنوکەییەکانیان دادەنێت، ڕێک وەک هەڵبژاردنی حیزبەکان سزادراوە و بەتەنها نزیکەی پێنج لەسەدی نەوەی نوێ ئامادەیە کە کاتی خۆی پێیبەخشێت و دەنگبدات. بەڵام ئەو کاتیگۆرییەی کە زۆربەی هەرە زۆری دەنگی نەوەی نوێ دەبات بریتیە لە: دەنگنەدان کە (٤٨٪) پێکدەهێنێت. بەراوردکردنی پێنج لە سەدی حیزبەکان بە چل و هەشت لە سەدی دەنگنەدان دەمانگەیەنێتە ئەو ئاستەی کە دیسانەوە کلیک لەسەر دۆسیەی ڕەشبینی و بێ متمانەیی نەوەی نوێ بکەینەوە. (بڕوانە گرافیکی ژمارە ٢).

ئێمە پێمانوایە، لە هەلومەرجێکی ئاوادا چەند قسەکردن لەسەر ڕووبەری دیموکراسی گرنگە، ئەوەندەش توێژینەوە لەسەر ڕووبەری کۆمەڵگەی ڕش و بێ متمانە لەبەرامبەر دیموکراسی و دەرکەوتەکانیدا گرنگە. لە کوردستانی ئێمەدا، سەدان کتێب لەسەر دیموکراسی نوسراوە، بەڵام دوو توێژینەوەی قووڵی زانستی لەسەر ڕووبەری بێ‌متمانەیی ئامادەنەکراوە. ئێمە ئەوەندەی بانگەشە بۆ دروشم و بەڵێنەکانی دیموکراسی دەکەین، نیو ئەوەندە تیشک ناخەینە سەر ئەو هەزاران ئەکتەرە کۆمەڵایەتیانەی هیچ متمانەیەکیان بە دیموکراسی، بە ئەکتەرەکانی، بە بەڵێنەکانی، بە مژدەکان و بە خەونەکانی نەماوە. لەکاتێکدا چەند دیموکراسی بەشداری لە دروستکردنی کردەی سیستەمێکی سیاسی لە کوردستاندا دەکات، هێندەش ڕووبەرەکانی بێ متمانەیی بەشداری لە دروستکردنی هەمان کردەدا دەکەن. واتە ڕووبەری بێ‌متمانەیی، بە بزوتنەوەکانییەوە، بە ئەکتەرەکانییەوە، بەڕێکخراوەکانییەوە، بە دەزگاکانییەوە، بە میکانیزمەکانییەوە، لەنێو خودی سیستەمە سیاسییەکەدایە، نەک لەدەرەوەی. لێرەوە،

فەرامۆشـــکردنی ئەم مەیـــدانە، نەک هەر فەرامۆشـــکردنی بەشـــێکە لە سیســـتەم، بەڵکـو بەشـداریکردنی ناڕاستەوخۆشـە لە لاوازکردنـی کـردەی سیستەمی سیاسی لە کوردستاندا کە لە ئێستا و ئێرەدا تەنها لەسەرەتای ڕێگادایە.

گرافیکی ژمارە ٢



لەبەرامبەر ئەو نوخبە سیاسییەی کە لە ڕێگای هەڵبژاردنی دیموکراتییەوە بەدەسەڵات گەشتووە، زانستە کۆمەڵایەتییەکان دوو جۆر مۆدێلی «بێ-متمانەیی» پێشنیاردەکەن: مۆدێلێکی لیبراڵی بێ-متمانەیی و مۆدێلێکی دیموکراتی بێ-متمانەیی.

لە مۆدێلی لیبراڵدا (مۆنتێسکۆ، مادیزۆن، کۆنستانت، سیسمۆندی)، کۆبوونەوەی هەموو دەسەڵاتەکان لەدەستی کەسێک یان دەزگایەکدا بە هەڕەشەیەکی مەزن لەسەر تەواوی کۆمەڵگە تەماشادەکرێت. لەم مۆدێلەدا دروستکردنی حکومەت گرنگە، بەڵام لە حکومەت گرنگتر ئەو شتەیە کە ناوی دەنێت «گومان» لە حکومەت. لێرەوە بەدەزگاییکردنی ئەم گومانە و فراوانکردنی چوارچێوەکانی دەرکەوتنی، دەبێت بە دڵە زیندووەکەی پرۆژەکانی. ئامانجی یەکەمی مۆدێلی لیبراڵ بریتیە لە پارێزگاریکردن لە مرۆڤەکان وەک ئەکتەری کۆمەڵایەتی «تاک» و ڕێگاگرتن لە ملکەچکردنیان لە ژێر زەبری پۆستاڵی دەسەڵاتدا. واتە ئەوەی کە دەبێت بە ناوەندی هەموو کەون، هەموو پرۆژەکان، هەموو سیاسەتەکان، هەموو حکومەتەکان تاکەکانی کۆمەڵگەن و هەر هەڕەشەیەک بەسەر ئەم تاکانەوە دەبێت بخرێتە گۆڕەوە.

ئەو زانایانەی کار لەسەر بیناکردنی مۆدێلی لیبراڵ دەکەن، پێیانوایە یەکێک لە میکانیزمە هەرە مەزنەکانی «نەگەڕانەوە «ی کۆمەڵگەیەک بۆ دیکاتۆرییەت، بۆ تۆتالیتاریزم، بۆ سیستەمی ستەمکاری، بریتیە لە ئامادەیی هەمیشەیی («بەرەنگاری[موقاوەمەت/ڕێزیستانس]»). بەرەنگاری لەبەرامبەر سەرۆکدا، لەبەرامبەر حکومەتدا، لەبەرامبەر هەموو ئەو دەزگایانەدا کە بە جۆرێک لە جۆرەکان دەسەڵاتیان لە ژێر دەستدایە؛ بۆنمونە لە کۆمەڵگەی کوردیدا، پێش حکومەت و دەزگاکانی، یەکەم

کردەی بەرەنگاری دەبێت ئاڕاستەی مەکتەبی سیاسی ئەو حیزبانە بکرێت کە لە پشت پەردەوە هەمووو ستراتیژیەکان دادەڕێژن و هەر کەسێک وەک پێویست جێبەجێیاننەکات دووریدەخەنەوە. لە هەر سیستەمێکی دیموکراسیدا، هەمیشە دەسەڵاتی وەزیر لە دەسەڵاتی ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی حیزبێک فراوانتر و بەهێزتر و تەنانەت شەرعیتریشە. بەڵام لە دیموکراسی کوردیدا، ئەم هاوکێشە جیهانییە پێچەوانەیە و مەکتەبی سیاسی بە واژۆیەک دەتوانێت وەزیرێک فڕێبداتە نێو پەراوێزە لەبیرکراوەکانی مێژووەوە.

لە دیموکراسی فەرەنسیدا، کە حیزبێک هەڵبژاردنەکان دەباتەوە و دەگاتە دەسەڵات، ئیتر ڕۆڵی هەمووو حیزبیەکان کاڵ کاڵ دەبێتەوە و تەنها ئەوانە دەردەکەون کە لە حکومەتدان. بۆنمونە کاتێک کە پارتی سۆسیالیستی فەرەنسی لە ٢٠١٢ دا هەڵبژاردنەکانی بردەوە و فرانسوا هۆلۆند وەک سەرۆکی کۆمار هەڵبژێردرا، ئیتر کارایی شەقامی «سۆلفێرینۆ» لە پاریس، کە بارەگای سەرەکی پارتی سۆسیالیستی لێیە، کۆتاییپێهات، بەڕادەیەک کە تەنانەت کەسێکی وەک مارتین ئۆبریش، کە تا دوێنێ جەنگی مان و نەمانی ڕەمزیی لەسەر پۆستی سکرتێری یەکەمی پارتی سۆسیالیست دەکرد، ئامادەنەبوو سەرلەنوێ خۆی بۆ هەمان پۆست کاندیدبکاتەوە و ڕێگای ماڵەوە و شارەوانییەکەی لە شاری لیل گرتەبەر!.

بەڵام لە دیموکراسی کوردیدا، پێش حکومەت و کاتی حکومەت و پاش حکومەتیش، هەموو دەسەڵاتە ڕاستەقینەکان هەر لەدەستی سەری ڕەش و قەڵاچوالاندان؛ بێهودەنییە ئەگەر کەسێک «ئیختیار» بکەیت لەنێوان مەکتەبی سیاسی و وەزارەتدا، بێ هیچ گومانێک مەکتەبی سیاسی هەڵدەبژێرێت!. وەزیرەکان دێن و دەڕۆن، بەڵام مەکتەب سیاسییەکان

هەمیشە لێرەن و بە جۆرێک لە جۆرەکان سیفەتێکی «خودایی»یان هەیە. ئەم تایبەتمەندیەی دیموکراسی کۆمەڵگەی ئێمە ڕەگوڕیشەکانی دەگەڕێتەوە بۆ «بیناکردنی» حیزب لەنێو «بونیە» ستالینییەکاندا کە لە جێگایەکی دیکەدا بە درێژی دەگەڕێینەوە سەری. لە هەلومەرجێکی ئاوادا، ئەو زانایانەی لەپشت مۆدێلی لیبراڵەوەن ڕاستەوخۆ پێتدەڵێن: فراوانبوونی ڕووبەرەکانی دیموکراسی لە کوردستاندا یەکسانە بە فراوانبوونی گومانی مەزن لە دەسەڵاتی مەزنی مەکتەب سیاسییەکان، پاشان وەزیرەکان و خوارەوەیان. بەپێچەوانەشەوە: ئەگەر گومانی مەزن لە دەسەڵاتی مەزنی مەکتەب سیاسییەکان لە فراوانبوونی هەمیشەییدا نەبێت، ئەوە مانای ئەوەیە کە ڕووبەرەکانی دیموکراسی لە فراوانبووندانین و دروشمەکان لە ئاستی گوتارەوە دانەبەزیونەتە سەر جیهانی پراکتیک.

تا چەند ئەم گریمانەیە لە کۆمەڵگەی کوردی پاش ڕاپەڕیندا بەدیهاتووە؟، تاچەند گومانی ئەکتەرە کۆمەڵایەتییەکان لەپەنای فراوانبوونی ڕووبەرەکانی دیمورکاسیدا فراواندەبن؟، تاچەند ئەکتەرە کۆمەڵایەتییەکان لە حیزبە سیاسییەکان دووردەکەونەوە بۆئەوەی بیانخەنە ژێر چاودێری بەردەوامەوە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە، ئێمە دیسانەوە دەگەڕێینەوە سەر ئەو چاوپێکەوتنانەی کە لەسەر میتۆدی «کالیتاتیف/چۆنایەتی» لەلایەن تیمی توێژینەوەکەمانەوە ئەنجامدراون.

وەفا، ژنێکی تەمەن ٣٣ ساڵانە، نیشتەجێی شاری سلێمانییە، لە گەڕەکی ڕزگاری لەدایکبووە، خاوەنی بڕوانامەی بەکالۆریۆسە، باوکی فەرمانبەرە و دایکی ژنی ماڵەوەیە، خاوەنی چوار برا و چوار خوشکە، پیشەی ئێستای مامۆستایە، دەگەڕێتەوە سەر چۆنیەتی پەیوەندیکردنی بە حیزب و پاشان چۆنیەتی وازهێنانی لە حیزب و سیاسەت. پاش

تێبینیکردنی مەودایەکی بکوژ لەنێوان دروشمەکانی حیزب و واقیعی ڕۆژانەدا، توشی جۆرێک لە بێ ئومێدی توند دەبێت و لە ئەنجامدا گومان دەخاتە سەر هەر جوڵەیەکی سیاسی:

«کاتێک سەیری پەیڕەو و پرۆگرامی ئەو گروپەم کرد کە کارم لەگەڵ دەکردن، حەزێکی خۆم تێکەڵ بەو گروپە کردبوو، ئەویش حەزی ڕۆشنبیریی خۆم بوو، ئەو گروپەم وەک دەروازەیەک بۆ بەدیهێنانی خەونەکانم تەماشادەکرد. بەڵام بەداخەوە هەندێک حاڵەتی نەشیاوم دەبینی، شتی سەلبی زۆرم دەبینی، بۆنمونە: دروشمەکانیان زۆر گەورە و جوانبوون، بەڵام لە ڕاستیدا وانەبوون. من وەک کچێک کارم لە گەڵ دەکردن، هەستم دەکرد، هەستم دەکرد ڕووبەڕووی حاڵەتێکی پەرچدانەوە دەبم، هەستم دەکرد کە ڕێگری زۆر دەکەن، وەک ئەوەی کە منی کچ لە ناویاندا جێگام نەبێتەوە.

لە لایەکیترەوە ئەو کارانەی کە دەکرا، هەستم دەکرد خزمەتی ئینسانی نییە، خزمەتکردنە بە گروپێکی تایبەت، بە بەرژەوەندی تایبەت. دوای ئەوەی ئەمانەم بینی، کە ئەم حەقیقەتە بۆمن کەشفبوو، هانیدام خێراتر بێمە دەرەوە و واز لە حیزب بێنم. کاری ئەم سیاسیانە ناشیرینکردنی سیاسەتبوو، ئەمە خاڵێکی زۆر سەلبی بوو، وایلێکردم کە ڕەنگە جارێکی تر، هەرگیز نەچمەوە ناو سیاسەت.

من تا لەناو ئەو حیزبەدابووم، هەستم بەوەدەکرد کە خۆم نیم، بەڵام کە هاتمە دەرەوە هەستم بە بوونی

**خۆمکرد. من ئیتر خزمەتی بەرژەوەندی چەند کەسێکم نەدەکرد، بەڵکو خزمەتی خۆم و مرۆڤایەتیم دەکرد.**

**پاش ئەوەی لە حیزب هاتمە دەرەوە، باشتر جیاوازییەکانم دەبینی، باشتر ململانێی نێوان هێزەکانم دەبینی، باشتر ئینتیما جیاوازەکانم دەبینی، باشتر دەمبینی کە ململانێی ئەم هێزانە لەسەر بەرژەوەندی تایبەتی چەند کەسێکە نەک خزمەتکردن بە کۆمەڵگە...».**

ناپاکیکردن لە دروشمەکان، مامەڵەکردن لەگەڵ کێڵگەی سیاسیدا وەک ڕووبەری پاوانکراو لەسەر پیاوان، بەکارهێنانی حیزب لەپێناوی بەرژەوەندی شەخسیدا، ڕێگانەدان بە سەرهەڵدانی خودێکی ڕەخنەگری بیرکەرەوە لەنێو حیزبدا، وا لە وەفا دەکەن کە گومان لە هەموو شتێکی حیزب بکات، گومانێکی بیناکراو لەسەر ئەزمونێکی تێکشکاو. گرنگی ئەم گومانە لەوەدایە کە وەفا بەرەو خودکوژی یان خەمۆکی نابات، بەڵکو دەیکات بە چاودێرێکی دنیای سیاسی و لەدەرەوە پشکنین بۆ ململانێکان دەکات، بەڕادەیەک کە دەتوانێت دنیای کۆمەڵایەتی و سیاسی وەک ڕووبەرێکی "پلوریال/کۆ/جەمع" ببینێت، نەک وەک ژمارەیەکی دابەشنەبوو. بێگومان بایەخی سۆسیۆلۆژیی ئەم دۆخەی وەفا لەوەدایە کە وەک دیاردەیەک (فینۆمینێک) لای زۆربەی ئەو ئەکتەرانەی کە چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا ئەنجامدراوە دووبارە دەبێتەو.

شنروێ، سی و یەک ساڵ، لەدایکبووی کەرکوک و نیشتەجێ لە هەولێر، هەڵگری بڕوانامەی بەکالۆریۆس، چوار خوشک و سێ برا، باوک و دایک خانەنشین، یەکێکە لەو ئەکتەرە کۆمەڵایەتییانەی کە کێڵگەی سیاسی کوردی و حیزبەکانی وەک دنیایەکی ڕەش دەبینێت و پێیوایە کە

بەپێی لۆژیکەکانی «تیۆری پیلان» کاردەکەن و بەڕێوە دەبرێن. بێگومان ئێمە قسەمان لەسەر ئەوەنییە کە بۆچونەکانی شنروێ ڕاستن یان نا، ئەمە گرفتی ئێمە نییە، گرفتی ئێمە ڕاڤەکردنی ئەو هەلومەرجە سیاسییەیە کە وا لە گەنجێکی ئەم کۆمەڵگەیە دەکات لە قەیرانێکی سەختی متمانەدا بژی، قەیرانێک کە بیگەیەنێتە ئاستی ئەوەی کە بڵێت:

**«یەکگرتوو موخابەراتی دەوڵەتانی خلیج بەڕێوەی دەبەن، کۆمەڵ موخابەراتی ئێران، زەحمەت کێشان حیزبێکی بازرگانە، سۆسیالیست هەمان ستایلی زەحمەتکێشانە، شیوعی کوژاوەتەوە و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ کادیرەکانی دەچنە ناو پارتی. پارتی عەقلێکی موخابەراتی هەیە و دەیەوێت لەسەدا هەشای کۆمەڵگەی کوردی بکات بە پارتی...**

**حیزبە کوردییەکان تا ئێستاش بە عەقلیەتی شاخەوە مامەڵەدەکەن، تا ئێستاش پێیانوایە هەر لە شاخن. ئێستا زروفێکی تر دروستبووە، دەبێت ئەو حیزبانە خۆیان بگۆڕن. ڕیفۆرم لەناو خۆیانا بکەن. بزانن ئێستا لەناو کۆمەڵگەدان نەک لە شاخ...»**

بایەخی ئەم خەیاڵدانەی شنروێ لەوەدایە کە خۆی ئەندامی حیزبێکی سیاسی کوردییە! لەگەڵ ئەوەشدا بەتوندی ڕەخنە لە چوارچێوە گشتییەکانی حیزبی کوردی و چۆنیەتی بەرهەمهێنانی سیاسەت دەگرێت. واتە هەلومەرجی بێ متمانەیی کۆمەڵگەی ڕەش بەتەنها ئەو ئەکتەرە کۆمەڵایەتییانەی نەگرتووەتەوە کە لەدەرەوی حیزبەکاندان، بەڵکو

ئەوانەشی گرتۆتەوە کە وەک شنرویّ، لەبەر هۆکاری تایبەتی خۆیان، لەنێو حیزبەکاندان.

شۆڕش، تەمەن ٣٨ ساڵ، لەدایکبووی شارباژێر، دانیشتوی سلێمانی، سێ خوشک و دوو برا، باوکی کاسب و دایکی ژنی ماڵەوە، خاوەنی بڕوانامەی دیپلۆمی تەکنیکی، بەم شێوەیە باس لە کۆمەڵگەی کوردی و کێڵگەی سیاسی دەکات:

**«حیزبی کوردی سیاسەتی ناشیرینکرد، سیاسەت لە هەموو وڵاتانی دنیادا بریتیە لەو پرۆسەیەی کە لەڕێگای ئاڵۆگۆڕکردنی دەسەڵات و سیستەمی سیاسییەوە بەڕێوە دەچێ. ئەمە سیاسەتە لە هەموو دنیادا و پێویستیی بە ئاڵوگۆڕی بەردەدام هەیە، وە پێویستی بە بەدیهێنانی ماف و ئازادی هەیە؛ پێویستی بە بەدیهێنانی مافەکانی مرۆڤ و ئازادی هەیە، پێویستی بە دابینکردنی خزمەتگوزاری و خۆشگوزەرانی هەیە.**

**بەڵام دەسەڵات لای ئێمە، سیاسەت لای ئێمە لەوەدا چڕبۆتەوە کە تا چەند دەتوانێ پلەی دەسەڵات وەربگریت، تا چەند دەتوانیت ئیماکاناتی ماددی بۆ خۆت کۆبکەیتەوە، تا چەند دەتوانی بەسەر خەڵکدا موسەیتەر بیت، تا چەند ئەتوانی بەخەڵک بڵێت من مەسئولم و تۆ هیچ نیت، من شۆڕشمکرد و تۆ نەتکرد، من قوربانیم داوە و تۆ خواردت. بەم شێوەیە حیزبی کوردی سیاسەتی ناشیرینکردووە، لەم وڵاتەیا سیاسەت بووە بە مەهزەلە بەڕاددەیەک کە ئێستا خەڵک هەموو شتە ناشیرینەکان ناودەنێن: سیاسەت.**

ئەركی سیاسەت بە قەناعەتی من دروستكردنی كۆمەڵگەیەكی سكۆلار و مەدەنی و مۆدێرنە، بۆ ڕاییكردنی كارەكانی كۆمەڵگە سیستەمێكی سیاسی تەندروست و دیموكراتی دروستدەكات. ئەركی سیاسەت بریتیە لە نوێنەرایەتیكردنی بەرژەوەندییەكانی خەڵك، بریتیە لە خۆشەویستكردنی سیستەمی سیاسی لای خەڵك، ئەمەش لەڕێگای ئاڵوگۆڕی بەردەوام و خۆ نوێكردنەوەوە.

دەبێت سیاسەت تاك وەك پیرۆزترین شت تەماشابكات. بەڵام بەداخەوە لە كوردستان هەموو ئەمانە بە پێچەوانەوەن. سیاسەت بانگەشەی دیموكراسی و ئازادی دەكات، بەڵام بەهیچ شێوەیەك جێبەجێی ناكات. ئێمە بانگەشەی دەسەڵاتێكی مۆدێرن و سكۆلار دەكەین، بەڵام یەكێتی زانایانی ئاینیمان هەیە. ئێمە باس لە ئازادی دەكەین ، بەڵام زیندانەكانمان پڕن لە زیندانیی سیاسی! حیزبەكانی ئێمە باس لەوەدەكەن كۆمەڵگەی ئێمە نمونەی دیموكراسی و ئازادییە و تەنانەت ئەوروپییەكان دەبێت دەرس لە ئێمەوە وەربگرن، بەڵام لەڕاستیا پێچەوانەكەی ڕاستە. دیموكراسی لای ئێمە ئەوەندە هەیە كە حیزبێك بەرژەوەندییەكانی نەكەوێتە مەترسییەوە، هەر كە هەستیبەوەكرد كە بەرژەوەندییەكانی دەكەوێتە مەترسییەوە، ئیتر دیموكراسی كۆتاییپێدێت.

لەبیرت نەچێت كە سیاسەتی كوردی كۆپیكردنی ئەزمونی بەعس و سیاسەتی بەعسە. هەر حیزبێكی ئێمە تا

**ئێستاش هەر هەڵگری هەمان کولتوری بەعسە و بەعس لە ئێمەدا دەژی! ...».**

دووبارەی دەکەمەوە کە ئامانجی ئێمە (لێرەدا) بریتییە لەوەی کە بزانین تاچەند گوتاری ئەکتەرە کۆمەڵایەتییە ئاساییەکانی ژیانی هەموو ڕۆژێک لەگەڵ واقیعدا یەکدەگرنەوە و تا چەند ڕاستدەکەن، کاری ئێمە لێرەدا بریتییە لە گەڕان بەدوای ئەو هۆکارانەدا کە ئەم یادەوەرییە کۆلێکتیڤە، ئەم شوناسە[٧]، بۆ نەوەیەکی بەرەڵاکراوی نێو کۆڵانەکانی مۆدێرنیتە و دیموکراسی دروستدەکەن. یادەوەرییەکی کۆلێکتیڤی توڕە، شوناسێکی توندی توڕە لە سیاسەتکردن، لە سیاسی، لە دابەشکرنی سامانی نیشتمانی، لە دروستبوونی ململانێی چینایەتی، لە نادادپەروەری کۆمەڵایەتی، لە ئامادەبوونی بەهێزی گەندەڵی، لە خۆ دووبارەکردنەوەی هەمیشەیی نوخبەی دەسەڵات، لە داخستنی دەرگاکان، لە خەساندنی کۆمەڵگە، لە هەلومەرجی زانکۆکان، لە هەلومەرجی پەروەردە،...!.

---

[٧] وشەی شووناس ئامازەیە بە هەموو ئەو چوارچێوانەی کەمن خۆمیان تیادا وێنادەکەم، هەروەکو بریتییە لە هەموو ئەو چوارچێوانەی کە ئەوانیدیکە منیان تیادا وێنادەکەن. شووناس هەمیشە لکاوە بە چەند هێمایەکەوە و لەڕێگایانەوە خۆی دەردەخات و بانگەشە بۆخۆی دەکات. شووناس یەکەیەکی نەگۆڕاوی هەمیشەیی نیە، چونکە لەنێو مێژوویەکی کۆمەڵایەتیدا دروستدەبێت و دەکرێت لەنێو مێژوویەکی دیکەی کۆمەڵایەتیدا هەڵبوەشێتەوە. شووناس هەروەک دەکرێت، لای تاکێک یان گروپێک، لەسەر ئاستی "موفرەد" دەربکەوێت، ئاواش دەکرێت لەسەر ئاستی "جەمع" دەربکەوێت. واتە تاکێک یان گروپێکی کۆمەڵایەتی دەکرێت لەیەککاتدا هەڵگری چەند شووناسێکی جیاوازبێت.

ئەوەی کە ئەم تێزەی ئێمە زیاتر دەسەلمێنێت، لێکچونی ڕادیکاڵی داتاکانی هەردوو توێژینەوە کانتیتاتیڤ (چەندایەتی) و کالیتاتیڤ (چۆنایەتی)ەکەن. واتە ئەگەر ئێمە بەتەنها پشتمان بە توێژینەوەیەکی چەندایەتی ( فۆرمی پرسیارکردنی داخراو) ببەستایە و چاوپێکەوتنی کراوەی چەند کاتژمێریمان لەگەڵ ئەکتەرەکاندا ئەنجامنەدایە، دەکرا بە ئاسانی ڕەخنەمان لەم دەرەنجامانە بگرتایە، بەڵام لێکدانی هەردوو میتۆدەکە و بەیەکگەشتنی هەردوو داتاکان، ڕاکردن لەم تێزە دەکات بە جۆرێک لە خۆدزینەوە.

ڕاستە ئەم داتایانە دەمانبەنەوە سەر بێ متمانەیی نەوەی نوێی کۆمەڵگەی کوردی؛ بەڵام ئەوەش ڕاستە کە ئەم بێ متمانەییە جۆرێک لە میکانیزمی چاودێریکردنی دنیای سیاسی لای خودی ئەم ئەکتەرانە دروستدەکات. لەهەر یەکێک لەو دێرانەی سەرەوەدا، ئێمە هەست بە ئامادەیی گیانێکی ڕەخنەگرانە دەکەین. گیانێکی هەمیشە بە خەبەری هاوڵاتیەک[8] کە نایەوێت خۆی بەدەست بەڵگە نەویستەکانەوە بدات و

---

[8] هاوڵاتیبوون تێرمێکی سیاسییە و ماوەیەک پێش هەڵگیرسانی شۆڕشی فەرەنسی وەک کۆنسێپت دەردەکەوێت بۆ ئەوەی هەموو مافە یاساییەکان بە سەرجەم ئەندامانی کۆمەڵگە بدات و هەموو ئەندامانی کۆمەڵگە لە لایەن یاساوە وەک یەک تەماشابکرێن. ئەمە ڕەگوڕیشەی ئەم کۆنسێپتەیە. بەڵام بێگومان بەدرێژایی مێژوو گۆرانکارییەکان ئەم کۆنسێپتەش گۆرانکاری بەسەردا هاتووە و ئاسۆی ماناکانی فراوانتر بوون. سەرەتا سۆسیۆلۆگە کلاسییەکەکانی وەک دۆرکایم و ڤیبەر و پارسۆنز بۆ توێژینەوە لەسەر ئەو کۆمەڵگە مۆدێرنانەی کە لەسەر پرەنسیپی تاکگەرایی دروستبوون بەردەوام پەنایان بۆ کۆنسێپتی هاوڵاتیبوون بردووە، چونکە لە نێو جەرگەی تاکگەرایی

دەیەوێت بەشداریبکات لە دەستنیشانکردنی چوارچێوە گشتییەکانی ئەو شتەی کە پێی دەوترێت پێگەی تاک لە کۆمەڵگەدا. ڕاستە ئەم تاکانە تورەن، بەڵام ئەم تورەییە نە بەرەو تیرۆریزمیان دەبات، نە بەرەو شۆڕش بەسەر کۆی کێڵگەکەدا، بەڵکو دەیانبات بەرەو قسەکردن لە خود وەک هاوڵاتییەکی سەربەخۆ و ئازاد کە بەدوای دانپێداناندا دەگەڕێت!.

بنیامین کۆنستانت [١٧٦٧-١٨٣٠]، دوو سەد و حەفدە ساڵ لەمەوپێش، واتە ساڵی ١٧٩٦، تەنها حەوت ساڵ پاش شۆڕشی فەرەنسی، لە کتێبێکدا بەناوی «هێزی حکومەتی ئێستای فەرەنسا و فەرمانی پشتیوانی لێکردنی» دەڵێت: ئازادی تاکەکان بریتیە لەوەی کە هەمیشە هەڵگری بۆچونێکی سەلبیبن لەبەرامبەر حکومەتدا و هەرگیز خۆیان وەک مێگەلێک تەماشانەکەن و حکومەتیش وەک شوان. ئەو

---

کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا هاوڵاتیبوون دێت بۆ ئەوەی هاریکاری ئۆرگانیک « la solidarité organique» لە نێوان ئەندامانی ئەو کۆمەڵگایانەدا دروسبکات.

تۆماس مارشال، گەورە سۆسیۆلۆگی بەریتانیا، سێ ئاستی هاوڵاتیبوون دەستنیشان دەکات: یەکەم: ئاستی مەدەنی. ئەم ئاستە لە سەدەی هەژدەوە دەستپێدەکات. وە لەم قۆناغەدا مرۆڤ وەک تاک مافی ئەوەی هەیە بە ئازادی بیربکاتەوە و بە ئازادی قسەبکات و بە ئازادی ئیمانبێنێت و کافربێت. دووەم: ئاستی سیاسی. لە سەدەی نۆزدەهەمەوە هاوڵاتیبوون لەسەر مافی دەنگدان و هاوبەشکردنی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە ژیانی سیاسیدا کلیکدەکات. ئەمەش بێگومان لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی نەتەوەییدا «Etat-Nation». سێیەم: ئاستی کۆمەڵایەتی. نووسەر پێی وایە ئەم ئاستە تەنها لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەوە دەستپێدەکات. لێرەدا هاوڵاتیبوون لەسەر کێشە و خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکان کلیکدەکات و پەروەدە و سۆسیال دەخاتە سەر لیستی ئەولەویاتەکانی.

پێیــوای کە بەبــێ چــاودێریکردنێکی بەردەوامــی حکــومەت لەلایەن تاکەکانەوە، گریمانەی گەڕانەوە بۆ ستەمکاری هەمیشە لێرەیە[٩].

ئەگەر ترســی گەڕانەوەی کــۆمەڵگەی فەرەنســی بــۆ سیســتەمی دەسەڵاتداریی پێش شۆڕشــی فەرەنسی، کە تەنها حەوت ساڵی بەسەردا تێپەڕیبــوو، دەســەڵاتی ڕەهــای پاشــایەتی، وای لە بنیــامین کۆنســتانت کردبێــت کە داوا لە فەرەنســییەکان بکــات کە بەشــێوەیەکی بەردەوام چــاودێری دەســەڵاتداران بــکەن و هەمیشــە لە بەرەی «پــێچەوانەدابن» لەگەڵ هەمــوو ئەوانەی کە لە جومگەکــانی دەســەڵاتدان، ئەوە ترســی کــۆمەڵگەی کــوردییە، کە مێژوویەکــی هەزار ســاڵەی لەگەڵ چوارچێــوە جیاوازەکانی دەسەڵاتی ڕەهادا هەیە ( خەلیفە، سوڵتان، ئەمیر، پاشا، سەرۆک )، لەگەڕانەوە بۆ تۆتالیتــاریزم[١٠]، دیکــاتۆرییەت یــاخود دیسپۆتیزم

---

[9] Benjamin Constant, *De la force du gouvernement actuel de la France et de la nécessité de s'y rallier*, Paris, 1796. http://classiques.uqac.ca/classiques/constant_benjamin.

[١٠] فەرهەنگی سۆسیۆلۆژی فەرەنسی بۆ پێناسەکردنی ئەم کۆنسێپتە دەگەڕێتەوە سەر «Zbigniew Brzezinski» نووسەری بەناوبانگی کتێبی « Ideology and Politics Power in Soviet». ئەو بەم شێوەیە لە تۆتالیتاریزم دەدوێت: "فۆرمێکی نوێی حکومەتە کە دەکرێت لە نێو پۆلێنکردنی گشتی دیکتاتاتۆرییەندا ببینینەوە (...)، تۆتالیتاریزم ئەو سیستەمەیە کە لەناوەوەیدا حاکمەکان تەواوی میکانیزمە تەکنۆلۆژییە هەرەپێشکەوتووەکان بەکاردێنن بۆ ئەنجامدانی شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی، کە توانای ئەوەی هەبێت دەستکاری هەموو شتەکان بکات. ئەم سیستەمە مرۆڤەکان لەسەر چەند بنەمایەکی ئایدۆلۆژی دەبینێت و بەپێی دووری و نزیکییان لەو ئایدۆلۆژیایەوە هەڵیاندەسەنگێنێت و بەرزیاندەکاتەوە و دایاندەبەزێنێت".

دەکرێت وایلێبکات کە هەرگیز دەستبەردای گومان لە نوخبەی سیاسی دەسەڵاتدار نەبێت و ئەم گومانە بکات بە دەزگای فەرمی چاودێریکردن. تەنها لەم ڕاڤەکردنەشەوەیە کە دەتوانین ڕووبەرێکی سیپی لە کۆمەڵگەی

---

ئەم تێرمە یەکەمجار ساڵی ١٩٢٠ لەلایەن مۆسۆلۆنییەوە بەمانایەکی پۆزەتیڤانە بەکارهاتوە «stato totalitario». مانا سەرەتاییەکانی ئەم فیکرەیە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی ڕاستەوخۆ بوون لەگەڵ ژیانی تایبەتی تاکگەراییدا. واتە ڕاکێشانی دەوڵەت بۆ نێو هەموو پانتاییەکان. بەدرێژایی ساڵانی جەنگی سارد ئەم کۆنسێپتە ئاسۆکانی بەرفراوانتر دەبێت و دەبێت بە چەکی جەنگی نێوان دەوڵەتەکان. لەگەڵ هانا ئارێنتیشدا تۆتالیتاریزم وەک چەمک ڕادەکێشرێتە نێو سۆسیۆلۆژیای سیاسییەوە. بەڵام گرفتی هانا ئەوەیە کە دەیەوێت جەوهەرێک بەم کۆنسێپتە ببەخشێت، یاخود جەوهەرگەراییانە مامەڵەی لەگەڵدا بکات. لێرەوە وەسفەکانی ئەو بۆ تۆتالیتاریزم لە مرۆدا ڕووبەڕووی ڕەخنەی جددی بوونەتەوە.

ئێمە بۆ دەستنیشانکردن و ناسینەوەی ڕژێمی تۆتالیتاریزم دەگەڕێینەوە سەر ڕایمۆند ئەرۆن کە یەکێکە لە پایەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکانی فەرەنسا. ئەو لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا لەسەر "دیموکراسی و تۆتالیتاریزم" پێنج ڕەگەزی سەرەکی ئەم ڕژێمە دیاری دەکات کە ئەمانەی خوارەوەن:

- یەک حیزب مۆنۆپۆڵی چالاکی سیاسی دەکات.
- ئەو حیزبەش لەسەر ئایدۆلۆژیایەک دروستبووە و ئەو ئایدۆلۆژیایەش دەبێت بە حەقیقەتی ڕەسمی دەوڵەت.
- ئەو حیزب و ئایدۆلۆژیایەش بەتەنها مۆنۆپۆڵی زەبروزەنگ و قەناعەتپێکردن دەکات.
- دەوڵەت دەست بەسەر بەشێکی زۆری چالاکییە ئابووری و پیشەییەکاندا دەگرێت و ئەو چالاکیانە ملکەچی حەقیقەتی ڕەسمی دەوڵەت دەبن.
- لێرەوە هەر هەڵەیەکی ئابووری یان پیشەیی دەبێت بە هەڵەیەکی ئایدۆلۆژی و خاوەنەکەی لەسەر سزا دەدرێت.

ڕەشدا ببینین و بەبێ ئەم تێزە ڕەشبوون و بێ ئومێدبوون تەواو تێکەڵ بەیەکتری دەبن.

بۆچی کۆمەڵگەی کوردی پێویستی بە توڕەبوون و بێ متمانەیی هەیە؟ بۆچی ئەم توڕەیی و بێ متمانەییە دەبێت بکرێن بە دەزگای چاودێری؟.

سیستەمی ئامادەباشی کوردی (بۆردیۆ دەڵێت ئەبیتیوس[11])، لە چرکەساتی چاودێرینەکردن و لێنەپرسینەوەی بەردەوامدا، توانای یەکجار

---

[11] پیەر بۆردیۆ، کە دەکرێت وەک درێژە پێدەری سۆسیۆلۆژیای مارکس و دۆرکایم بخرێتە سەر شانۆ، هابیتیوس وەک هابیتیوس سیستەمێک لە ئامادەباشی پێناسە دەکات. ئەم سیستەمی ئامادەباشییەش لە هەموو چرکەیەکدا ئامادەیە بۆ پێشوازیکردن لە ئەزموونەکان. کە ئەزموونێک دێتە پێشەوە، لە قۆناغی یەکەمدا پەلیدەگرێت و رای دەکێشێتە ژورەوە، بۆردیۆ ئەمە ناو دەنێت، ناواندن، واتە راکێشانە ناوەوە، هێنانە ژورەوە، لەدەرەوە بۆ ناوەوە. لەم قۆناغەدا، هابیتیوس لە ناوەوە تەواو دەستکاری ئەو ئەزموونە دەکات و سەرلەنوێ دایدەرێژێتەوە و رەنگیدەکاتەوە و جلوبەرگی لەبەردەکاتەوە و ئامادەی دەکات بۆ قۆناغی دووەم، کە بریتییە لە فڕێ دانەوەی بۆ دەرەوە، بەدەرەوەکردنی، دەرەواندنی. کاتێک ئەم ئەم ئەزموونە دێتە دەرەوە و دەیخەینە ژێر چاودێرییەوە، هەستبەوەدەکەین کە زۆر جیاوازە لەو چرکەیەی کە هێشتا پەلکێشی ناوەوە نەکراوە.

واتە ئەزموونەکە لەلایەن هابیتیوسەوە ماڵی و دەستەمۆکراوە. تائەو کاتەی کە هابیتیوس دەتوانێت ئەزموونەکان ماڵیبکات هیچ گرفتێک دروست نابێت، بەڵام گرفت کاتێک دروسدەبێت کە هابیتیوس نەتوانێت ئەزموونێک ماڵیبکات. لە چرکەیەکی ئاوادا و لە یەکەم چرکەی بەریەککەوتنیاندا ئیتر هابیتیوس وەک لاپەڕە دەدڕێت. کە هابیتیوسیش دڕا ئیتر سیستەمی ئامادەباشیش پەکی دەکەوێت و توانای ناواندن و دەرەواندی ئەزموونەکانی نامێنێت. لەهەمانکاتدا ئەزموونەکان لە هاتن ناوەستن، بەڵام ئیتر سیستەمێکی ئامادەباشی لێرە نیە بۆ ئەوەی پێشوازییان لێبکات! دەرەنجام

هەروەها لەدەرەوەی ئۆپۆزسیۆنی نێوان تاک و کۆمەڵدا کاردەکات و بەسەر چەمکەکانی دۆرکایمدا بازدەدات کە پێی وابوو، بەتەنها "کۆ" بابەتی سۆسیۆلۆژیایە و تاک لە نێو "دێتێرمینیزم"ی ڕەهای کۆمەڵگەدا چوارچێوەکانی بوونی دیاری دەکرێت. نۆربێر ئێلیاس یەکێکە لە سەرچاوە گرنگەکانی ئەم قوتابخانەیە و لەبری کلیک کردن لەسەر ئۆپۆزسیۆنی نێوان "دووانە" دژ بەیەکەکان، هەوڵدەدات کار لە سەر پێکهاتە کۆمەڵایەتی و بیناکردنەوەیان بکات. ئێلیاس گرنگی بەو هەلومەرجانە دەدات کە وا لە تاکێک دەکەن "ئیلتیزم"ی خۆی ڕاگەیەنێت و دەبن بە چوارچێوەی ڕەفتار و گوتارەکانی. واتە ئەوەی جێگای باسە لای ئێلیاس ستراکتۆرەکان نین، بەڵکو ئەو شتەیە کە لە زمانی فەرەنسیدا بە "پرۆسێسیوس" ناو دەبرێت و بریتییە لە کۆی ئەو جوڵانەوە و بیرکردنەوە و کردەو کارکردن و ڕەوتەی کە "ئەکسیۆن"ێکی تیادا دروستدەبێت.

بێرگەر و لویکمان لە تێکستە بەناوبانگەکەیاندا "بیناکردنی کۆمەڵایەتی واقیع" بنەما گشتییەکانی بیناگەرییان دارشت و تیشکیان خستە سەر "**کۆمەڵایەتی**" وەک "**بیناکردنێکی**" بەردەوام. ئەوان بەدرێژی لەسەر ڕۆڵی وشیاری لە بیناکردنی کۆمەڵایەتیدا وەستان. بێرەگەر ساڵی ١٩٦٧ و لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا " **ئاین لە نێو وشیاری مۆدێرندا**" ئەم چوارچێوە کۆنسێپتیولەییەی بۆخستینە سەر شانۆ. لەم کتێبەدا ئەو بەوردی باس لە ڕۆڵی ئیماندارەکان دەکات لە دەستنیشانکردنی چوارچێوەکانی واقیعدا. لەم "موقارەبەیەدا" سەرلەنوێ فینۆمینۆلۆژیای هیوسێرل خراوەتەوە بەر باس و لێکۆڵینەوە و شتێکی دیکەی لێدروستکراوە بەناوی فێنۆمینۆلۆژیای کۆمەڵایەتی.

هەروەها کارەکانی پیەر بۆردیۆش، بەتایبەتی چەمکی "هابیتیوس" هەوڵدانێکە بۆ دەرچوون لە تەڵەزگەی دوالیزم. لە سیستەمی ئامادەباشیدا، واتە "هابیتیوس"، پراکتیکەکان نە سەد لە سەد ملکەچی ستراکتۆرەکان، نە سەد لە سەدیش سەریەخۆن لە ستراکتۆرەکان. هەرچەند ئێمە پێمانوایە سۆسیۆلۆژیای پیەر بۆردیۆ زیاتر لە دێتێرمینیزمەوە نزیکترە تا بیناگەری.

تا ئێرە ئێمە باسمان لە مۆدێلی لیبراڵی بێ-متمانەیی کرد. ئێستا کاتی ئەوەهاتووە کە بگەڕێینەوە سەر مۆدێلێکی دیکە لە بێ-متمانەیی کە زاناکانی بواری زانستە کۆمەڵایەتییەکان بە بێ-متمانەیی دیموکرات ناویدەبەن. لەم مۆدێلەدا بەرەی تاکەکانی کۆمەڵگە و بەرەی نوخبەی دەسەڵاتدار وەک دوو لێکدژی هەمیشەیی وێنا ناکرێن و «حیقدێکی ڕەش» پردی پەیوەندی نێوانیان دروستناکات. بێ-متمانەیی دیموکرات بریتیە لە بەکارهێنانی تەواوی ئەو میکانیزمانەی ڕێگا بە هاولاتیان دەدەن تا چاودێری چۆنیەتی جێبەجێکردنی هەموو ئەو بەڵێنانە بکەن کە پێش گەشتن بە دەسەڵاتی حیزبێک یان چەند حیزبێک بە جەماوەریان دابوو. لەم مۆدێلەدا هاولاتیان دژایەتی دەسەڵات ناکەن، بەڵکو هاوڕێیەتی

---

فەردانییەتی میتۆدۆلۆژی کە قوتابخانەیەکی بەناوبانگی سۆسیۆلۆژیایە، وەک کاردانەوەیەک لەبەرامبەر هۆلیزم و دیتێرمینیزم دا، لەسەر بیناکردنی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕێگای ڕەفتار و گوتاری تاکەکانەوە کلیکدەکات. واتە لەم قوتابخانەیەدا ئەوەی ڕەفتار و گوتاری تاکەکان بینادەکاتستراکتۆرە کۆمەڵایەتییەکان نین، بەڵکو پێچەوانەکەیەتی.

لەکاتێکدا سۆسیۆلۆژیای ستراکتۆریالیست و دیتێرمینیست و هۆلیست دەیەوێت چوارچێوەی کۆمەڵایەتی وەک دەرهاویشتە و وەک مۆدێلی چەندایەتی بناسێنێت، سۆسیۆلۆژیای بیناگەری بەپێچەوانەوە دێت و هەوڵدەدات کلیک لەسەر مەلەفی ئەو پرۆسانە بکات کە لەڕێگایانەوە دیاردە کۆمەڵایەتی و کاتیگۆرییە کۆمەڵایەتییەکان بینادەکرێن. باشترین نموونەش توێژینەوەکانی پرۆفێسۆر لوک بۆلتانسکییە کە ئێستا یەکێکە لە "مەرجەعەکانی" فیکری فەرەنسی. بەتایبەتی کتێبی "چوارچێوەکان" کە ساڵی ١٩٨٢ بڵاوبۆتەوە. بۆلتانسکی ئێستا پرۆفێسۆرە لە "قوتابخانەی باڵا" و هەموو ڕۆژێکی هەینی سیمینارێک دەبات بەڕێوە.

دەکەن، چاودێری دەکەن و دەیانەوێت بزانن تا کوێ هەڵبژێردراوەکان ڕێز لە دەنگەکانیان دەگرن و ئەو پڕۆژانە جێبەجێدەکەن کە بوون بە هۆی بەدەستهێنانی متمانە و دەنگی هاوڵاتیان. گەر هاوڵاتیان توانای ئەوەیان تێدابێت گروپێک بگەیەننە دەسەڵات، توانای ئەوەشیان تیادایە کە چاودێرییان بکەن و لە ساتەوەختی ناپاکیکردن لە پڕۆژەکان و بەڵێنەکان سزایان بدەن.

لە هەرێمێکی وەک کوردستاندا خراپترین شت بریتیە لە پشتکردنە دیموکراسی، بریتیە لە دژایەتیکردنی دیموکراسی و گەڕانەوە بۆ جەنگی ناوخۆ و لەوێشەوە بۆ دیکاتۆریەت و دیسپۆتیزم. لێرە چەند ئەم مۆدێلەی دووەم ئامادەبێت و کەڵکی لێوربگیرێت، هێندەش کولتووری دیموکراسی بەنێو کۆمەڵگەدا شۆڕدەبێتەوە و بەئاسانی کەسێک، گروپێک یان چەند حیزبێک ناتوانن هاوکێشەکان بگۆڕن.

بێ‌متمانەیی دیموکرات بە سێ میکانیزمی سەرەکی کاردەکات: یەکەمیان بریتیە لە دەسەڵاتی چاودێریکردن، دووەمیان فۆرمەکانی ڕێگالێگرتن و سێهەمیشیان «ئیمتیحانکردن»ی بڕیارەکانی دەسەڵاتدارانە[13]. ئامادەیی ئەم میکانیزمانە لە هەر کۆمەڵگەیەکدا سیستەمی سیاسی دەپارێزێت لەو شتەی کە زانستە کۆمەڵایەتییەکان ناویدەنێن «دیموکراسی وەرزی»؛ واتە دیموکراسییەک کە بەپێی هەوا، حەز، بەرژەوەندی و ئارەزووی کەسێک یان گروپێک کاردەکات و هەرکاتێ ویستیان هەڵبژاردن ڕێکدەخەن و هەر کاتێکیش نەیانویست سەدان بیانوی

[13] Pierre Rosanvallon, *La contre-démocratie, la politique à l'âge de la défiance*, Seuil, Paris, 2006, p.14.

وەک: هەڕەشە لەسەر نیشتمان، مەترسی لەسەر نەتەوە، جەنگی ناوخۆ، ئامادەنەبوونی هەلومەرجی بابەتی،...، دروستدەکەن و دوایدەخەن بۆ کاتێکی دیارینەکراو. لە دیموکراسی وەرزییدا کە هەڵبژاردنێک کۆتاییپێدێت ئیتر تەنها خوا دەزانێت کەی هەڵبژاردنی داهاتوو ئەنجامدەدرێت و هیچ کەس و لایەن و دەزگایەک ناتوانێت بەرواری هەڵبژاردنی داهاتوو بزانێت.

کوردستانی نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو باشترین بەڵگەیە. لە ساڵی ١٩٩٢ دا یەکەم هەڵبژاردنی ئازاد ئەنجامدەدرێت، دواتر هیچ دەسەڵاتێک، دەزگایەک، ئەکتەرێک نەیتوانی بەرواری هەڵبژاردنی دووەم دەستنیشانبکات. ئەم بەروارە نەک هەر دەستنیشاننەکرا، بەڵکو خودی پرۆژەکەش وەک ئۆتۆمۆبیلێکی خراپ پەکی کەوت و تا ٢٠٠٥ نەکەوتەوە ئیش! پاراستنی کۆمەڵگەی کوردی لەم جۆرە لە دیموکراسی، لە دیموکراسی وەرزی (وەرزانە)، و جێگیرکردنی دیموکراسییەکی هەمیشەیی متمانەپێکراوی دامەزراو، یەکسانە بە ئامادەیی بەهێزی هەر یەکێک لەم سێ میکانیزمە. هەر ئەکتەرێک، هەر گروپێک، هەر حیزبێک، هەر ڕێکخراوێک دژایەتی ئەم میکانیزمانە بکات، ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، دژایەتی لەدایکبوونی دیموکراسی و کولتووری دیموکراسی لە کۆمەڵگەی کوردیدا دەکات.

لە کۆمەڵگەی فەرەنسیدا، هەر ڕاڤەکردنێکی دیموکراسی، پرۆژەکانی، تایبەتمەندییەکانی، ئەکتەرەکانی، ڕاستەوخۆ دەمانباتەوە سەر میکانیزمەکانی بێ متمانەیی دیموکراتیک کە بەشێکە لە سیستەمە سیاسییەکە و بەبێ تێگەشتن لێی ناتوانین لە کۆمەڵگەی فەرەنسی تێبگەین. دەمەوێت بڵێم، وەک چۆن حیزب، وەزارەت، ململانێی گەشتن

بەدەسەڵات فاكتی سیاسین، ئاواش هەر یەكێك لە میكانیزمەكانی بێ‌ متمانەیی دیموكراتیكیش (دەسەڵاتی چاودێریكردن، فۆرمەكانی ڕێگالێگرتن، «ئیمتیحانكردن»ی بڕیارەكانی دەسەڵاتداران) فاكتی سیاسین و لەنێو كردەی سیاسەتدا دەجوڵێنەوە[14].

ئەم ڕوونكردنەوەیە دەدەم چونكە دەزانم لە كۆمەڵگەی كوردیدا زۆر جار حیزبە سیاسییەكان جەنگێكی بێهودە بەناوی شەرعیەتی سیاسییەوە بەو ئەكتەرانە دەفرۆشن كە لەنێو یەكێك لە میكانیزمەكانی بێ‌متمانەیی دیموكراتیكدا كاردەكەن و دەیانەوێت لەم ڕێگایەوە سەرمایە ڕەمزییە سیاسییەكەیان بریندرابكەن. خستنە سەر شانۆی ئەم ئەكتەرانە وەك «نەفامی سیاسی» یان وەك «موراهیقی سیاسی» جۆرێكە لە گوناه بەرامبەر كردەی سیاسەتكردن، سیستەمی سیاسی و خودی دیموكراسیش لە كۆمەڵگەی كوردیدا كە گوێی دنیای كەركردووە بە دروشمی پۆست تۆتالیتاریزم و پۆست دیكتاتۆریەت.

بێ‌متمانەیی، وەك دیاردەیەكی مەزنی جیهانی، بەتەنها لە ئاستێكدا ئیشناكات، بەتەنها گرفتی كێڵگەی سیاسی نییە، بەڵكو لە چەندین ئاستی جیاواز و لەنێو چەندین كێڵگەدا ئیشدەكات. لە كتێبە بەناوبانگەكەیدا (كۆمەڵگەی ڕیسك) ئیولریش بێك بەوردی باس لەو هۆكارانە دەكات كە وایانكردووە، لەسەر تەكنیك، كۆمەڵگەكان لەبەردەم مەترسی هەمیشەییدابن و دواتر كەس متمانە بەكەس نەكات. بێك لە تێبینییەكی سەرەتاییەوە دەچێتە نێو توێژینەوەكەی و پێیوایە كە

---

14 Marcel Gauchet, *La démocratie contre elle-même*, Gallimard, 2002.

یان سێ ساڵی هەلومەرجی ئابووری بکەن[16]. ئەو قەیرانە سەختانەی کە لە بانکەکان دەدەن، کە ئەژنۆی شەریکە گەورە جیهانییەکانیان شکاندووە، کە دەرگا بە هەزاران کارگە دادەخەن و هەزاران هەزار کرێکار و فەرمانبەر بێ کاردەکەن و فڕێیان دەدەنە سەر شەقامەکان، ئەو قەیرانە ئابوورییانەی کە بازاڕە گەورەکانی بۆرسەیان کردووە بە کابینەی سایکۆلۆگەکان، مرۆڤی مۆدێرنیان وەرگێڕاوەتە سەر «مەخلوقێک» لە بێ-متمانەیی سەرتاپاگیر: بێ-متمانەیی لەبەرامبەر پارەدا، لەبەرامبەر پرۆژەکاندا، لەبەرامبەر بەڵێنەکاندا، لەبەرامبەر خاوەنکارەکاندا، لەبەرامبەر موچەکاندا. بەکورتی بستێک لە ڕووبەری ئابووری نەماوە کە پڕنەبووبێت لە بێ-متمانەیی هاوڵاتیان[17].

گەورەتر لە بێ-متمانەیی تەکنۆلۆژی و ئابووری، بێ-متمانەیی کۆمەڵایەتی گەشتوەتە ئاستێکی مێژوویی بێ پێشینە. هەلومەرجی نوێی مرۆڤەکان دەستی خستوەتە نێو هەناوی هەموو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانەوە و وەک لاپەڕەی ڕەشکراوەی بەکارهێنراو، یەک یەک دڕاندوونی. لەسەر ئاستی جیهان، زۆر کەمن ئەو مرۆڤانەی کە متمانە بە مرۆڤەکانی دیکە دەکەن. لە وڵاتێکی وەک بەرازیلدا تەنها (٢,٨٪)ی

---

16 Charistian Chavagneux, *Une briève histoir des crises financière : des tulipes aux subprime*, La Découvèrte, 2011.

١٧ کاتێک لە ساڵی ٢٠٠٨ دا قەیرانێکی ئابووری سەرتاپای جیهان دەگرێتەوە، بەشێکی گرنگ لە هاوڵاتییە ئەمەریکییەکان کە کارەکەی لەدەستدابوو، خانوەکانیان کە بە دوو سەد هەزار دۆلار کڕیبوو، بە دە هەزار دۆلار فرۆشت! بەڕێوەبەری گشتی کارگەیەکی فەرەنسی، کە تادوێنێ بە ئۆتۆمۆبیلی پۆرش نەبووایە هاتوچۆی نەدەکرد، کە کارگەکەی ئیفلاسیکرد، دواتر لە سەنتەرێکی کۆمەڵایەتی بێ لانەکاندا خۆیبینیەوە!.

هاوڵاتیـان پێیـانوایە کە دەتـوانن متمـانە بە خەڵـک بـکەن. واتە زیـاتر لە نەوەد و هەشـت لە سـەدی بەرازیلیەکـان پێیـانوایە کە نـاتوانن متمـانە بەوانیدیکە بکەن[١٨]! بێگومان بەرازیل لە خواری خـوارەوەی پەیـژەکەوەیە و دەکرێت وەک هەلومەرجێکی ڕادیکاڵ تەماشای بکەین، بەڵام ئەمە مانـای ئەوەنیـیە کە لە وڵاتـانی دیـکەدا پرسـی متمـانەکردن پۆزەتیڤبێـت. لە وڵاتێکی وەک فەرەنسادا تەنها بیست و دوو لەسـەدی هاوڵاتیـان پێیـانوایە کە دەتوانن متمانە بەوانـی دیـکە بـکەن، واتە لەسـەدا حەفتـا و هەشـتیان پێیانوایە کە ناتوانن متمانە بەوانی دیکە بکەن[١٩].

لە کوردسـتاندا ئەم هاوکێشـەیە لە ئاسـتێکی تەواو نزمـدایە و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ، دیاردەی سیاسـی و کـۆمەڵایەتی و ئابوورییەکـان، لاپەڕە یەک لەدوای یەکەکانی متمـانە دەدڕێـنن. بەپێـی ئەو تـوێژینەوە مەیـدانییەی کە پێشـتر ئامـاژەمـان پێـدا، ئەو پێـنج هەزار و سێسـەد و شەسـت و شـەش کەسـەمان ڕووبەڕوی پرسـیارێک لەسـەر «ئیشـکالییەتی» متمـانە کردووەتەوە:

متمـانەت بە کـام لە مـانەی خـوارەوە هەیە؟، لە وڵامیشـدا هەشـت بژاردەمان خستوەتە بەردەستیان:

---

[18] Pierre Rosanvallon, *La contre-démocratie. la politique à l'âge de la défiance*, Seuil, Paris, 2006, p.17.

[١٩] یەکێک لەو کارە زانستیە هەرە باشانەی کە لەسەر ئەم ئیشکالیەتە کراوە بریتیە لە کتێبە بەناوبانگەکەی ئالان ئێرونبێرگ بەناوی ماندووبوون لە خود. پێمـوایە وەرگێرانـی ئەم کتێبە بۆ زمانی کوردی دەبێت بە یەکێک لە خزمەتە بێوێنەکان.

Alain Ehrenberg, *La fatigue d'être soi. Dépression et société*, Odile Jacob, 2000.

بەتەنها نزیکەی پێنج لە سەد متمانەیان بە حیزبە کوردییەکانی نێو کێڵگەی سیاسی کوردستان هەیە. تەنها نزیکەی حەوت و نیو لە سەد متمانەیەنا بە پەرلەمان هەیە، دەزگاکانی ڕاگەیاندنیش بەشێکن لە بێ متمانەیی و تەنها نزیکەی شەش لە سەدی متمانەی هاوڵاتیانیان بەدەست هێناوە. حکومەتی هەرێمی کوردستانیش لە هەمان قەیراندایە و تەنها نزیکەی حەوت لە سەد متمانەی پێدەکەن. بەڵام ئەوانەی کە متمانە بەهیچ یەکێک لەم دەزگا و ئەکتەرانە ناکەن سی و شەش لە سەدن. ( بڕوانە گرافیکی ژمارە ٣).

گرافیکی ژمارە ٣



هەمان ئەم دەرئەنجامانە لەڕێگای چاوپێکەوتنە ڕاستەوخۆکانیشەوە ئامادەن و پێمان دەڵێن کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە کوردییەکان هەڵدەوەشێنەوە و پەیوەندییەکانی هاریکاری ترادسیۆنیی میکانیک دەدرێن. پەیوەندی منداڵان بە باوک و دایکەوە، بەرزبوونەوەی ئاستی تەڵاق، کۆچ بەرەو ئەوروپا، گەشتی مرۆڤی کورد بەبێ خێزانەکەی بە وڵاتاندا، دابەزینی ڕێژەی منداڵ دروستکردن، پەلەنەکردن لە ژن هێنان و شووکردن، سەرهەڵدانی شوقەی تاکە کەسی لە شارەکاندا، بەرزکردنەوەی ئاستی بەرخۆری تاکە کەسی و وێناکردنی سەرمایە وەک تاکە پەنا و پاڵپشت،...، هەموو ئەمانە و چەندین دیاردەی دیکە دەمانبەنەوە سەر ئەوەی کە بێ‌متمانەیی کۆمەڵایەتی زۆر بەوردی لە خانەکانی کۆمەڵگەی ئێمەدا ئیشدەکات و نەبینینی و پاشان نەخوێندنەوە و کارلەسەر نەکردنی، دواتر لەگەڵ کۆمەڵگەیەکی نەخۆشی بەرەڵاکراوی سپێردراو بە داهاتوییەکی پڕ لە مەترسیدا ڕووبەڕوومان دەکاتەوە.

لە لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانیماندا لەسەر کوردەکانی ئەوروپا، هەمان دەرئەنجام خۆی بەدەستەوە دەدات. کانی، کچێکی تەمەن ٢٢ ساڵە، لە قۆناغی یەکەمی زانکۆ لە بەریتانیادا دەخوێنێت، دوو برا و دوو خوشکی هەیە، باوکی پارێزەرە، دایکی زیاتر لە کارێک دەکات، بەم شێوەیە باس لە ژیانی خۆی دەکات:

«من هەست بەوەدەکەم کە من و خێزانەکەم لە یەکتری تێناگەین. ئەوان بەجۆرێک دنیا دەبینن و منیش بەجۆرێکی تر دنیا دەبینم. بینینەکانمان زۆر جیاوازن. ئەمەش سەرچاوەی بەشێکی زۆر لە کێشەکانمانە. یەکەم بەرپرسیار لە ژیانی من خێزانەکەم نییە، من خۆمم. بەڵام

**ئەوان پێیانوایە کە یەکەم بەرپرسیارن لە ژیانی من. من دەمەوێت وەک مرۆڤێک ئازادبم لە هەموو ئەو شتانەدا کە دەیانکەم، بەڵام ئەوان بەشێوەیەکی پراکتیکی ئەو ئازادییەم لێ زەوت دەکەن...**

**هەستبەوە دەکەم کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پەیوەندییەکانمان کاڵدەبنەوە. ئەو شتانەی کە بەیەکمانەوە دەبەستنەوە کەم دەبنەوە. زۆر جار بەخۆم دەڵێم: چی دەکەم لەمماڵەدا؟ بۆ جانتاکەم کۆناکەمەوە و بڕۆمە دەرەوە؟ ژیان لەگەڵ ئەم کەسانەدا بەکەڵکی چی دێت؟ گەر ئەمرۆش ئەوە ڕوونەدات، ڕۆژێک هەر دێت ڕوودەدات...».**

گریمانەکەی کانی ڕاست دەرچوو. چەند مانگێک دوای ئەم قسانەی، جانتاکەی پێچایەوە و ماڵەوەی بەجێهێشت. لە ماوەی زیاتر لە ساڵێکدا زۆر بە دەگمەن لەگەڵ باوکی دا قسەیکردووە، زۆر بەدەگمەن دوو وشەی گەرموگوڕی لەگەڵ دایکیدا گۆڕیوەتەوە. کانی لەگەڵ خێزانەکەیدا وامامەڵەدەکات وەک ئەوەی کە ماڵەوە زیندان و دەرەوە ڕووبەری ئازادی بێت.

**«زۆر جار کە گفتوگۆ لەگەڵ باوکم یان دایکمدا دەکەم، بە هەرا و دەنگەدەنگ و هەندێک جاریش بە توندوتیژی کۆتایی پێدێت. نە ئەوان دەتوانن لە منێکی مرۆڤ و ئازاد تێبگەن، نە منیش دەتوانم وەک ئەوان بژیم و خۆم مەحکومی کولتوورێک بکەم کە بەسەر چووە...».**

پروشە، کچێکی حەڤدە ساڵە، باوکی بێ کارە و دایکی لە وێستگەی شەمەندەفەر واگۆنەکان پاکدەکاتەوە. پروشە تەنها برایەکی بچوکی هەیە. گرفتی ئەو لەگەڵ خێزانەکەیدا بریتیە لە هاوڕێکانی:

**«من دەمەوێت وەک هاوڕێکانم بم. نامەوێت هەندێک هەڵسوکەوتبکەم کە هەستبەوە بکەن کە من لەوان جیام. ئەمە باوک و دایکم زۆر بێزار دەکات... ئەوان دەیانەوێت کە من وەک کوردستان بجوڵێمەوە، بەڵام شاری "پ" وەک هەولێر نییە. ئەوان نایانەوێت من هاوڕێی کوڕم هەبێت، نایانەوێت لەگەڵ هاوڕێکانمدا بڕۆمە دەرەوە. هەمیشە تەلەفۆنەکەم، فەیسبوکەکەم کۆنترۆڵدەکەن...».**

ئەوەی کە زۆر دایک و باوکی بێزار دەکات، لوتەوانەکەیەتی. وەک کچە ئەوروپییەکانی هاوڕێی، پروشە لوتەوانەیەکی لە لوتدایە، پانتۆڵەکەی لەسەر ئەژنۆیدا چەند درزێکی تیادایە، پێڵاوی باسکێت لەپێدەکات، تاتۆیەکی لەسەر پشتی ملی کردووە. هەر یەکێک لەم نیشانانە ڕووبەری چەندین ناکۆکی توندوتیژن لە نێوان خێزانەکەیدا. باوکی هەڕەشەی ئەوەی لێدەکات کە گەر بەردەوامبێت ناچاردەبێت کە جانتاکانی کۆبکاتەوە و ماڵەکەی بەیەکجاری بەرێتەوە بۆ کوردستان!. پاش ئەوەی کە گفتوگۆکان بە بن بەست دەگەن، وەک هەمیشە دایکی بەدەم گریانەوە خەودەیباتەوە و سبەینێ، کاتژمێر چواری بەیانی لەخەو هەڵدەستێت، بۆئەوەی خێرا نانی بەیانی بخوات و کاتژمێر پێنج بگاتە سەر کارەکەی.

لێرەوە درانە کۆمەڵایەتییەکان لە ئەوروپادا، زۆر بەهێزتر و توندتر ئامادەن و لە ئاستێکی خەیاڵیی پەلەکردندا خۆیان بەدیدەهێنن. دەمەوێت بڵێم: ئەوەی کە ئێمە باسیدەکەین، چەند دۆخێکی ڕیزبەڕی نێو

پەراوێزەکان نییە، بەڵکو دیاردەیەکی کۆمەڵگەیی گشتییە و لە چەندین ڕووبەردا خۆی دووبارە دەکاتەوە و هەر ئەمەشە کە دەیکات بە بابەتێکی سۆسیۆلۆژی سەرەکی «قابیل» بە توێژینەوە[٢٠].

[20] Emile Durkheim, *Les règles de la méthode sociologique (19894)*, Flamarion, 1999.

# (٢)
# بۆئەوەی دیموکراسی هیتلەر دروستنەکاتەوە

یەکێک لە پرسیارە هەرە گەورەکانی دیموکراسی لەسەر خۆی بریتیە لەوەی کە چۆن بەدەستی خۆی تراژیدیا بۆ خودی خۆی دروستنەکات؟، چۆن دواتر پرۆژە جیاوازەکانی نەبن بە دروستکەری گۆڕستانی خۆیان؟، چۆن دیموکراسی جارێکی دیکە ڕێگا نەدات هیتلەر، کە لەڕێگای هەڵبژاردنەوە گەشتە دەسەڵات، دروستببێتەوە؟، چۆن دیموکراسی هۆلۆکۆست دووبارە نەکاتەوە؟، چۆن سەرۆکی هەڵبژێردراو نەبێت بەو خوداوەندە پیرۆزەی کە نابێت کەس باس لە دابەزینی لەسەر عەرش بکات؟، چۆن ڕێگا بگیرێت لەوەی کە دیموکراسی نوخبەیەکی مافیا دروستنەکات؟، چۆن لە سێبەری دیموکراسیدا چینێکی کۆمەڵایەتی[٢١]

[٢١] لە ترادیسیۆنی مارکسیستدا چەمکی چینە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر دوو بۆچوونی سەرەکی دادەمەزرێت. یەکەمیان بریتیە لە دابەشکردنی کۆمەڵگە بەسەر دوو گرووپدا، گروپی چینی کرێکاران و گروپی چینی سەرمایەداران، دووەمیشیان بریتیە لە پەیوەندی ململانێگەرای هەیمەنە و بەکارهێنان لەنێوان ئەو دوو گرووپەدا. لەم ترادیسیۆنەدا چینە کۆمەڵایەتییەکان وەک دوو دژە-بەرامبەری کۆمەڵایەتی-ئابووری

خراونەتە سەر شانۆ، دوو دژە-بەرامبەرکە کۆی شتەکان بە پەیوەندی بیناکراو لەسەر ململانێی نێوانیانەوە دەبەستێتەوە و هیچ شتێک لەم چوارچێوەیە ناڕواتە دەرەوە.
ئەم بیرکردنەوە مارکسییە ڕێگامانپێدەدات هەلومەرجە بابەتییەکان بکەین بەسەرچاوە، بۆنموونە ڕێگامانپێدەدات کە خاوەندارێتی کەرەسەکانی بەرهەمهێنان جیابکەینەوە لەو کەسانەی کە هەمان کەرەسە بەکاردەهێنن، ئەم بیرکردنەوەیە خۆی "کامڵ" دەکات کاتێک کە خودگەرایی/زاتیەتی/سوبژێکتیڤیتێی ئەکتەرە کۆمەڵایەتییەکان دەکات بە سەرچاوەیەکی دیکەی سەرەکی، مەبەستمان " وشیاری چین"ە. تەنها ئەمەشە کە، پاش کارل مارکس، دەرگای گفتوگۆمان بۆ دەخاتە سەرپشت لەگەڵ بیریارێکی بەناوبانگی وەک Nicolas Boukharine. ئەم بیریارە جیاوازی دەخاتە نێوان "چین لە خۆیدا" و "چین بۆ خۆی" و هەوڵدەدات تیشک بخاتە سەر کردەی گوزەرکردن لە نێوانیاندا، بەتایبەتی لە چرکەی وشیاربوونەوەدا. هەر لەسەر هەمان ڕێگا جۆرج لۆکاشیش، بەتایبەتی لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (وشیاربوونەوەی چین و مێژوو)، کلیک لەسەر فیتیشیزمی کاڵا و بەشتکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و پرسیارلەخۆکردن لەسەر توانای پرۆلیتاریا لە ساتی ڕامان لە دۆخە تایبەتەکانیدا دەکات.

بەدرێژایی سەدەی بیستەم چەمکی چینی کۆمەڵایەتی لای کارل مارکس، کە چەمکێکی فرە چوارچێوەییە، ڕەخنەیلێگیراوە. سەرەکیترین ڕەخنەیەک کە ئاراستەی ئەم چەمکە مارکسییە کرابێت بریتیە لەو تێبینییە مەیدانییەی کە دەڵێت: کۆمەڵگە لەسەر ئاستی کۆنکرێتی ململانێی نێوان دوو چینی کۆمەڵایەتی دژ بەیەک پێکنەهاتووە، بەڵکو لە ململانێی چەندین گروپی کۆمەڵایەتی پێکەوە-ژیاو بەڵام لە یەکجیا پێکهاتووە.
هەروەها ڕەخنەیەکی دیکەی سەدەی بیستەم، لە ماکس ڤێبەرەوە سەرچاوەدەگرێت، بریتییە لە تێکەڵکردنی چەمکی چین و چەمکی ستاتیو. ڤێبەر نموونە بە کرێکاران دەهێنێتەوەو پێیوایە کە تەنها لە هەلومەرجێکی تایبەتدا چەمکی چین و چەمکی ستاتیو لای کرێکاران تێکەڵ بەیەکدەبن، بۆنموونە کۆبوونەوەی کرێکاران لە جێگایەکی تایبەتدا، تەنها لەم کاتەشدا کردەی ڕێکخراوی چین دەبێت بە ئەگەرێکی کۆنکرێتی،

ئەگەرنا ئەو تێکەڵبوونە سیفەتێکی هەمیشەیی نییە و ئەم کردەیەش ئەگەرێکی کۆنکرێتی بەردەوام نییە.

ڕەخنەیەکی دیکە کە لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمەوە سەر هەڵدەدات بریتیە لە قسەکردن لەسەر کۆتایی چینە کۆمەڵایەتییەکان، چ لەسەر ئاستی تیۆری و چ لەسەر ئاستی پراکتیک. ئەم ڕەخنەگرانە پێیانوایە کە دەسەڵات ئیتر بەتەنها گرەوی نێوان چینی سەرمایەدار و چینی کرێکار نییە، چونکە لە ئێستادا خودی ئەو دەسەڵاتە بەسەر هەموو کاتیگۆرییە کۆمەڵایەتییەکاندا دابەشبووە و هەمووان پێکەوە بەشدارن لە دروستکردنیدا، بەتایبەتی لە کۆمەڵگە دیموکراتەکاندا.

لەمڕۆدا، قسەکردن لەسەر "چینیە کۆمەڵایەتییەکان" وەک قسەکردنێکی ئەرکایک دێتە بەرچاو. ڕاستە لە ئێستادا مارکسیزم پێگەی لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا لاوازبووە و وەک ساڵانی شەستەکان و حەفتاکان نەماوە، بەڵام ئەمە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە چەند ڕەگەزێکەوە هەیە کە دەیانەوێت دەرگا لەسەر چەمکی چینە کۆمەڵایەتییەکان دابخەن.

یەکێک لەو ڕەگەزانە گۆڕانی ستراکتۆری کۆمەڵایەتی خودی کۆمەڵگەیە. ئەم ستراکتۆرە نوێیە ئیتر لە دابەشکردنی کۆمەڵگە بەسەر دوو گرووپدا جێگای نابێتەوە. بێگومان ئەم گۆڕانەش بەرهەمی چونەدەرەوەی ئەو کۆمەڵگایانەیە لەو شتەی کە ناومان نابوو زەمەنی پیشەسازی.

ڕەگەزێکی دیکەی سەرەکی ڕەوانەی فۆرمە نوێکانی چەمکی ململانێمان دەکات لەنێو خودی کۆمەڵگە نوێکاندا: لەنێو دڵی ژیانی کۆلێکتیڤدا، ئیتر ناکرێت پرۆلیتاریای کرێکاری بکرێت بە مەشخەڵی گەشاوەی ململانێ کۆمەڵایەتییەکان. ئاخر لەئێستادا چەندین ئەکتەری دیکە هاتوونەتە سەر شانۆ، ئەم ئەکتەرانە زیاتر کولتوورین تا کۆمەڵایەتی، بۆنموونە دەرکەوتنی بزووتنەوە ئاینییەکان، بزووتنەوەی ئافرەتان، بزووتنەوەی خوێندکاران، بزوتنەوەی ئەلتەرمۆندیالیزم، هتد. هەموو ئەمانە پێگەی خۆیان لە چەمکی "چینە کۆمەڵایەتییەکاندا" نادۆزنەوە.

ئەوەشمان لەبیرنەچێت کە تەنانەت خودی ململانێ کرێکارییەکان، ڕەهەندە یونیڤێرسێلە مارکسییەکەیان لەدەستداوە و لە ئێستادا ئەوان گۆڕانی بۆ ئەو خەونە

نەبێت بە خاوەنی هەموو شتێک و چینێکی دیکە هیچی نەبێت؟، چۆن بەناوی شەرعیەتی دیموکراسییەوە کۆمەڵگە نەکرێت بە ڕانە مەڕ و چینی دەسەڵاتداریش بە شوان؟، چۆن دیموکراسی دەتوانێت ڕێگا لەوە بگرێت حوسنی موبارەکێکی دیکە لە میسر، بن عەلییەکی دیکە لە تونس دروستنەبێتەوە؟، چۆن لە لیبیادا جارێکی تر قەزافی دروستنەبێتەوە؟، چۆن دیموکراسی دەتوانێت ڕێگا لە گەڕانەوەی سەدام حوسەین بۆ دەسەڵات بگرێت؟، کە ئێمە هەموومان لە نێو کولتووری بەعسدا گەورەبووبین، چۆن دیموکراسی دەتوانێت لە تارماییەکانی تۆتالیتاریزم و دیکتاتۆرییەت ڕزگارمانبکات؟.

بۆ کارکردن لەسەر ئەو «ئیشکالیەتە» ترسناکەی لەم پرسیارە توندانە دروستدەبێت، گەڕانەوە بۆ زانستە کۆمەڵایەتییەکان و سەرلەنوێ خوێندنەوەی ئەو مەعریفە گەورەیەی کە لەم بوارەدا بەرهەمیانهێناوە

---

مارکسییە نالێن کە دەیوسیت کرێکاران هەموو مرۆڤایەتی لە کۆت و زنجیری کۆیلایەتی ڕزگاربکەن.

چەمکی "چینە کۆمەڵایەتییەکان" لەسەرەتادا لەسەر وێناکردنی پەیوەندی ململانێگەرای نێوان دوو گرووپی کۆمەڵایەتی جێگیر لە نێو کۆمەڵگەدا دامەزرابوو و پرسیاری کۆمەڵایەتیش گرەوی سەرکی هەردوو لایان بوو. بەڵام لەمڕۆدا خودی ئەو پرسیارە کۆمەڵایەتییە نەک هەر لەنێو پەیوەندی نێوان ئەو دوو گرووپە کۆمەڵایەتییەدا دروستنابێت، بەڵکو لە ئامادەنەبوونی ئەو پەیوەندییەدا دروستدەبێت. لە ئێستادا خراپترین تراژیدیای پرۆلیتارێک بریتینییە لە "ئیستیغلالکردنی"، بەڵکو بریتییە لە ئامادەنەبوونی "ئیستیغلالکردن"، بریتیە لە پەراوێزخستنی، فڕێدانەدەرەوەی. تۆ کە لەدەرەوەی کۆمەڵگە بیت، ئیتر چۆن دەتوانین پەیوەندی ململانێی لەگەڵدا دامەزرێنیت، چۆن دەتوانیت بڕۆیتە نێو ژیانی کۆمەڵایەتییەوە. سەرچاوە : عادل باخەوان، ئاین چییە؟، دەزگای سەردەم، ٢٠٠٨.

دەبێت بە فەرمانی یەکەم. یەکێک لەو میکانیزمانەی ئەم زانستانە پێشنیاریدەکەن بریتیە لە: دەسەڵاتی چاودێریکردن. هەر دەسەڵاتێک با لە ڕۆحی دیموکراسیشەوە هاتبێتە دەرەوە، با لەڕێگا دیموکراسیشەوە هەموو یاریەکانی بردبێتەوە، گەر لەلایەن دەسەڵاتی چاودێریکردنی بەردەوامەوە هاوڕێیەتی نەکرێت، لەهەر چرکەیەکدا دەتوانێت خۆی وەربگێڕێتە سەر ڕژێمێکی تۆتالیتاریست یان دیکتاتۆر.

گەر هاوڵاتیانی کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو مافی ئەوەیان هەبێت کە لەڕێگای دەنگدانی ئازادەوە، گروپێکی سیاسی بگەیەننە دەسەڵات، دەبێت مافی ئەوەشیان هەبێت بەردەوام چاودێریی پراکتییکەکانی هەمان ئەو گروپە لە دەسەڵاتدا بکەن. لە هەر کۆمەڵگەیەکدا کە چیرۆکی پەیوەندی نێوان هاوڵاتیانی دەنگدەر و کاندیدە دەنگپێدراوەکان تا دوای هەڵبژاردن بڕیکات، چانسی سەرهەڵدانی دەسەڵاتێکی ستەمکار، توندڕەو، سوڵتەوی، زەبروزەنگاوی، پاوانکار و خوێناوی لە ئاستێکی تەواو بەرزدایە. لێرەوە تێکۆشانی کۆمەڵگەیەک لەپێناوی بەدەستهێنانی مافی چاودێریکردنی دیموکراسیدا دەبێت کەمتر نەبێت لە تێکۆشان لە پێناوی بەدەستهێنانی خودی دیموکراسیدا.

هەڵبژاردن وەک فاکتێکی «ڕووتوقوت» هەڵگری بونیەیەکی لەرزۆکە و دەرگا لەسەر چەندین گریمانەی ترسناک دەکاتەوە. هەڵبژاردن وەک فاکتی «ڕووتوقوت» دەکرێت کۆمەڵگەیەک بەرەو جەنگی ناوخۆ ببات (کوردستانی نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو)، دەکرێت کۆمەڵگەیەک فڕێبداتە باوەشی ڕژێمێکی تۆتالیتارەوە (ئەڵمانیای هیتلەر)، دەکرێت کۆمەڵگەیەک بخاتە نێو دەستی ڕژێمێکی فاشیستەوە (ئیتاڵیای مۆسۆلۆنی)، هەڵبژاردن دەکرێت ببێت بە هۆکاری دروستکردنی جینۆساید

(کۆنگۆی نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو)، هەڵبژاردنی ڕووتوقوت دەکرێت ببێت بە یاری منداڵان (سەدام حوسەین هەمیشە هەڵبژاردنەکانی بەڕێژەی لە سەد ٩٩ دەبردەوە).

ئەو کۆمەڵگەیەی کە پێیوایە هەڵبژاردنی ڕووتوقوت بەسە بۆئەوەی ڕژێمێکی دیموکراسی دابمەزرێنێت، تا سەر ئێسقان لە وەهمدا دەژی!، ئەو کۆمەڵگەیەی کە پێیوابێت لەڕێگای هەڵبژاردنی ڕووتوقوتەوە دەتوانێت متمانە بە نوێنەرەکانی بکات، تا سەر ئێسقان لە وەهمدا دەژی، ئەو کۆمەڵگەیەی کە پێیوابێت لەڕێگای هەڵبژاردنی ڕووتوقوتەوە دەتوانێت دڵنیابێت لەوەی کە لەنێوان دوو دەورەی هەڵبژاردندا دیکتاتۆرێک دروستنابێت، تاسەر ئێسقان لە وەهمدا دەژی. لە ڕژێمێکی لەم جۆرەدا، هەموو چرکەیەک دەتوانرێت پەرلەمان بکرێت بە دەزگایەکی کارتۆنی، وەزارەتەکان بە دەزگای داپڵۆسین و ئابووری وڵات بە جەنگی ململانێ لەگەڵ نەیارەکاندا.

بۆ بەرجەستەکردنی ئەم تێزە، دەکرێت لێرەدا و بەشێوەیەکی خێرا نمونە بە ئەزمونی لۆران باگبۆ، سەرۆکی پێشوی کۆت دیڤوار (ساحیلی عاج[22]) بێنینەوە. لۆران کە لە ٣١ مایسی ١٩٤٥ دا لەدایکبووە، یەکێکە لەو ئەکتەرە سیاسییانەی لە زانکۆکانی فەرەنسادا خوێندنی تەواوکردووە و هەموو ئاستە باڵاکانی، قۆناغ بە قۆناغ بڕیوە. بەدرێژایی نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو، خۆی وەک دیموکراتیترین ئەکتەری سیاسی لە ئەفریقادا دەخستە سەر شانۆی سیاسی و هەموو میکانیزمەکانی ڕوبەڕووبوونەوەی

---

22 Auzias, D. (2013). Côte d'Ivoire (Paris: Nouvelles éd. de l'Université).

لەگەڵ سەرۆک کۆماری وڵاتەکەیدا دەخستەکار. بەڵێنەکانی لۆران باگبۆ بە ئیڤوارییەکان؛ بەڵێنی دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی دیموکرات، دابەشکردنەوەی سامانی نیشتمانی لەسەر بنەمای دادپەروەری کۆمەڵایەتی، دابەزاندنی ڕێژەی هەژاری بەشێوەیەکی بەرچاو، ئازادکردنی ژیانی حیزبی و ڕێکخراوەیی، چەسپاندنی مافەکانی مرۆڤ برگە بە برگە، دروستکردنی یەکێتی نیشتمانی لەنێوان باکور و باشوری وڵاتەکەیدا، مامەڵەکردنی لەگەڵ ئیڤوارییەکاندا لەسەر بنەمای هاوڵاتی مۆدێرن و سەدان بەڵێنی دیکە، دروست لە خەونبینی ئیماندارێک بە بەهەشتەوە دەچوون. لە ساڵی ٢٠٠٠ دا ئیڤوارییەکان متمانەی پێدەبەخشن و وەک سەرۆک کۆماری وڵاتەکەیان هەڵی دەبژێرن.

لەو چرکەیەوە کە دکتۆر لۆران باگبۆ، مێژوونووسی پەروەردەکراو لە بەردەستی زنا گەورەکانی فەرەنسادا، دەگات بەدەسەڵات، کۆت دیڤوار ڕووبەڕوی چەندین قەیرانی سیاسی و سەربازی و ئابووری دەبێتەوە و، لەنێو ئەم قەیرانانەشدا، جار لە دوا جار کاتی هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی دوادەخات. لۆران باگبۆ، کە لەڕێگای هەڵبژاردنەوە گەیشتبووە دەسەڵات، نەیدەویست جارێکی تر بڕواتەوە بەردەمی سندووقەکانی دەنگدان، تەنها ئەو کاتە نەبێت کە دڵنیادەبێت لەوەی سەرکەوتن بەدەستدەهێنێت. لە ماوەی یانزە ساڵدا لۆران باگبۆ کەڕبوو لە بەرامبەر ڕەخنەکاندا، کوێربوو لەبەرامبەر دیمەنە تراژیدییەکانی وڵاتەکەیدا، لاڵبوو لەبەرامبەر هەژمونی سەرتاپاگیری هەژاریی وڵاتەکەیدا. ئەوەی بۆ ئەو گرنگ بوو کۆنترۆڵکردنی دەسەڵات، هەموو دەسەڵاتەکان بوو.

لەماوەی دە ساڵدا، کۆت دیڤوار نەک هەر نەبوو بەو بەهەشتەی کە لۆرانی مێژوونووس باسیدەکرد، بەڵکو بوو بەو دۆزەخەی کە هەزاران

لۆران باگبۆ لەڕێگای هەڵبژاردنەوە گەیشتە دەسەڵات، بەڵام لەڕێگای جەنگێکی سەربازی توند و خوێناوییەوە، کە فەرەنسا بەشداری تێداکرد، کۆشکی کۆماری بەجێهێشت. لە ١١ ئاڤریلی ٢٠١١ دا باگبۆ دەستگیردەکرێت و ڕەوانەی دادگای لاهای لە هۆڵەندا دەکرێت[23]!.

ئێمە لەم ئەزمونەوە فێری ئەوەدەبین کە هەڵبژاردنی ڕووتوقوت نەک هەر کۆمەڵگەیەکی دیموکرات دروستناکات، بەڵکو دەکرێت ببێت بە منداڵدانی دروستکردنی دیکتاتۆرێک کە تەنها و تەنها بە زەبری ئاگر و ئاسن نەبێت لەسەر کورسییەکەی نەیەتە خوارەوە. بەڵام کەی و لەچ کاتێکدا و چۆن دیموکراسی دەتوانێت ئەم گریمانانە بخاتە نێوان دوو کەوانەوە؟.

دیموکراسی لەهەلومەرجێکدا دەتوانێت ئەم هەموو گریمانە ترسناکانە بخاتە نێوان دووکەوانەوە، کە لەلایەن کۆمەڵگەی مەدەنییەوە چاودێری بکرێت و بخرێتە ژێر پاڵەپەستۆی «جەبرە» جۆراوجۆرەکانەوە. دەسەڵاتی چاودێریکردن بریتییە لە کردەی پشکنینی هەمیشەیی پرۆژە، بڕیار، پراکتیک و جوڵانەوەکانی نوێنەرە دەنگپێدراوەکان و ڕاکێشانیان بۆ بەردەم دەزگا جۆراوجۆرەکانی لێپرسینەوە. لێرەوە، ململانێکردن لە پێناوی بەدەستهێنانی «پێگەکانی» دەسەڵاتی چاودێریکردندا، کە ڕژێمی دیموکراتیک سەقامگیردەکات، هیچی کەمتر نابێت لە ململانێ لەپێناوی بەدەستهێنانی پێگەکانی دەسەڵاتدا.

لە وڵاتێکی وەک عێراقدا کە دیکتاتۆرییەت برینی قوڵی لە ڕۆحی هەر عێراقییەکدا دروستکردووە، بەبێ دروستکردنی چەندین میکانیزمی جیاوازی گومان لە دەسەڵات لەلایەن کۆمەڵگەی مەدەنییەوە، بەبێ

23 Le Monde, 02 mars 2013.

کـــۆنترۆڵکردنی دەســـەڵات، بەبـــێ پشـــکنینی دەســـەڵات، بەبـــێ ئەم میکانیزمـانە، لەسـەر ئاسـتی بـابەتی، نەک هەر ئەیاد عەلـلاوی، ئیبـراهیم جەعفەری یان نوری مالیکی، بەڵکو هەر عێـراقییەک بە ئاسـانی دەتوانێـت ببێت بە سەدام حوسەینێکی تر[٢٤]! .

یەکێـک لە سیفەتە گرنگەکـانی دەسـەڵاتی چـاودێریکردنی دیموکراسـی بریتییە لەوەی کە هەمیشەییە. بەپێچەوانەی هەڵبژاردنەوە کە دەکرێـت بـۆ نمـونە چـوار سـاڵ جارێـک ئەنجامبـدرێت، ئەم دەسـەڵاتە لە هەمـوو ساتەوەختێکدا دەتوانێت لە کارکردنـدا بێـت. هەروەهـا سـیفەتێکی دیـکەی ئەوەیە مەرج نیـیە بەردەوام لەسـەر ئاسـتی کـۆ کاربکـات، چـونکە هەر تاکێکی کۆمەڵگە دەتوانێت ببێت بە چاودێرێکی ڕۆژانە. لێـرەوە دەسـەڵاتی چاودێری بەنێو جەستەی تەواوی کـۆمەڵگەی مەدەنیـدا دەکشـێت و لە هەر شوێنێکدا دەسەڵات هەبێت، دەسەڵاتی چاودێریکردنیش ئامادە دەبێت.

بەڵام ئایا دەسـەڵاتی چـاودێریکردن بەتەنهـا بەسـە بـۆئەوەی کـۆمەڵگە خۆی لەو گریمانە کارەساتاوییانە بپارێزێـت کە پێشـتر ئاماژەمـان پێـدان؟، بێگومـا نەخێـر. دەسـەڵاتی چـاودێریکردن، بەبـێ دەسـەڵاتی سـزادان هـیچ مانایەکی نییە. کـۆمەڵگەی زینـدووی دیموکراتیـک لەو هاوڵاتیـانە پێکدێت کە چۆن نوێنەرەکانیان هەڵدەبژێرن و چاودێرییـان دەکەن، ئـاواش لەکـاتی هەر «لادانێکـدا» سـزایان دەدەن. لێـرەوە دەسـەڵاتی سـزادان وا لە دەسەڵات دەکات کە نەتوانێت بە ئاسـانی بڕیـار لەسـەر پرۆژەکـان بـدات و یاری بە ژیانی هاوڵاتیان بکات.

---

[٢٤] بگەڕێرەوە بۆ: عادل باخەوان، عێراق لە فەیسەڵەوە تا تاڵەبانی، چاپخانەی ڕەنج، ٢٠٠٦.

لەژێر کارایی دەسەڵاتی سزاداندا، کۆمەڵگەی مەدەنی دەتوانێت حکومەت بە دادپەروەری کۆمەڵایەتی، بە ململانێ لەگەڵ گەندەڵیدا، بە ڕێزگرتن لە ژیانی هاوڵاتیان، بە گەڕانەوەی بەردەوام بۆ بەرژەوەندییە باڵاکانی کۆمەڵگە ناچاربکات.

لە وڵاتێکی وەک فەرنسادا، کاتێک کە سەرۆک وەزیران، دۆمینک دوڤیلپان لەساڵی ٢٠٠٥ دا، پرۆژە یاسایەک لەسەر کارکردنی لاوان پێشکەش بە پەرلەمان دەکات، هەزاران لاوای فەرەنسی دەڕژێنە سەر شەقامەکان و لە ڕێگای خۆپیشاندانەکانەوە، نەک هەر پرۆژەکەیان هەڵوەشاندەوە، بەڵکو هەموو داهاتووی سیاسی "دۆمینک دوڤیلپان"یان بۆ هەمیشە فڕێدایە پەراوێزەکانەوە. تا پێش ئەو پرۆژەیە سەرۆک وەزیران زۆرترین چانسی هەبوو کە لە بری سەرکۆزی ببێت بە سەرۆکی وڵات، بەڵام لەگەڵ پێشنیارکردنی ئەو پرۆژەیەدا کەوتە بەر نەفرەتی دەسەڵاتی سزادانی کۆمەڵگەی مەدەنییەوە و تا ئێستاش لە پەراوێزەکانی سیاسەتدا نەهاتوەتە دەرەوە.

ژیرۆم کاویزاک، یەکێک لە بەهێزترین وەزیرەکانی فرانسوا هۆلاند، سەرۆک کۆماری ئێستای فەرەنسا (٢٠١٣)، وەزیری بوجە، کە تەنها تارماییەکەی بەشێکی زۆر لە وەزیرەکان و بەڕێوبەرە گشتییەکانی وەزارەتەکانی دەترساند. لە کۆتایی ساڵی ٢٠١٢ دا ڕۆژنامەیەکی ئەلەکترۆنی فەرەنسی بەناوی میدیا پارت، کە بە یەکێک لە ڕۆژنامە هەرە «جددیە» فەرەنسییەکان ناسراوە، بابەتێک لەسەر کاویزاک بڵاودەکاتەوە و باس لەوەدەکات کە ئەم وەزیرە بەڕێزە حسابێکی بانکی لە سویسرا هەیە و ٦٠٠ هەزار ئیرۆی لەسەرە. بێگومان ئەم جۆرە حسابە بانکییانە لە فەرەنسادا بە نایاسایی لەقەڵەم دەدرێن و خاوەنەکەی دەخرێتە ژێر سەدان گومانی نەک هەر یاسایی، بەڵکو ئەخلاقی و سیاسیشەوە.

گەڕانەوەیەکی خێرا بۆسەر کرۆنۆلۆژیای ڕوداوەکان لەسەر کاویزاک ڕەنگە وانەیەکی گرنگبێت لە چۆنییەتی چاودێریکردنی نوخبەی دەسەڵات لەلایەن کۆمەڵگەی مەدەنییەوە.

- **٠٤ دێسمبەر ٢٠١٢**

ڕۆژنامەی میدیا پارت پێدادەگرێت لەسەر ئەوەی کە لەسەرچاوەیەکی نهێنی باوەڕپێکراوەوە کاسێتێکی دەستکەوتووە کە تا ساڵی ٢٠١٠ ژێرۆم کاویزاکی وەزیری بوجە، حسابێکی لە بانکی UBS ی سویسریدا هەبووە و شەش سەد هەزار ئیرۆی لەسەر بووە. لەهەمان ڕۆژدا کاویزاکی وەزیر بەتوندترین شێوە ئەو تۆمەتە ڕەتدەکاتەوە.

- **٠٥ دێسەمبەر ٢٠١٢**

ڕۆژنامەی میدیا پارت ئەو تۆمارە دەنگییە بڵاودەکاتەوە کە تیایدا ژێرۆم کاویزاک باس لە حسابە بانکییەکەی دەکات. چەند دەزگایەکی تایبەتمەند لە بواری بەراوردکردنی دەنگدا دانبەوەدا دەنێن کە ئەو دەنگە ڕێک دەنگی کاویزاکی وەزیرە.

- **٠٦ دێسەمبەر ٢٠١٢**

ژێرۆم کاویزاک لە دادگا شکات لە ڕۆژنامەی میدیا پارت دەکات و بە ناوزڕاندن تاوانباری دەکات. پاشان هێرشەکانی وەزیر بۆ سەر هەمان ڕۆژنامە و ڕۆژنامەنوسەکانی دەستپێدەکات.

- **٠٧ دێسەمبەر ٢٠١٢**

دادگا مەلەفێکی سەرەتایی بۆ مەسەلەکە دەکاتەوە و دەست بە لێکۆڵینەوە دەکات. تائێرە ڕووداوەکان بە ئاراستەی بەرژەوەندی وەزیر ڕێدەکەن.

- **١٩ دێسەمبەر ٢٠١٢**

کاویزاک داوا لە بانکی UBS دەکات بەڵگەنامەیەکی بۆ بنێرن کە بەهیچ شێوەیەک حسابی لای ئەوان نەبووە و لە ئێستاشدا هیچ حسابێکی لای ئەوان نییە. بەڵام UBS وەڵامی داواکەی ناداتەوە.

- **٢١ دێسەمبەر ٢٠١٢**

ئەکتەرێکی سیاسی بەناوی میشێل گۆنێل دێتە سەر شانۆ و باس لەوەدەکات کە ئەو کاسێتەی بە میدیا پارت گەشتووە ڕاستە و خودی خۆی سەرچاوەکەیەتی. میشێل گۆنێل ئەو ئەکتەرە سیاسییەیە کە هەڵبژاردنەکانی لە شاری ڤیلنۆف دو لۆت بە ژیرۆم کاویزاک دۆراند.

- **٠٨ ژەنیوەری ٢٠١٣**

لێکۆڵینەوەکانی دادگا چەند قۆناغێک دەچنە پێشەوە و وردە وردە بازنەکە لە دەوری کاویزاکی وەزیر تەسکتر دەبێتەوە.

- **٠٦ فێبریوەری ٢٠١٣**

ڕۆژنامەی لو ژورنال دو دیمانش پێ لەسەر ئەوەدادەگرێت کە سویسرا دۆکۆمێنتێکی ناردووە بۆ حکومەتی فەرەنسی کە باس لە بەرائەتی ژێرۆم کاویزاک دەکات. بەڵام ڕۆژنامەی میدیا پارت تۆمەتەکانی ناکێشێتەوە و زیاتر پێیان لەسەر دادەگرێت.

- **١٥ مارس ٢٠١٣**

ڕۆژنامەی میدیا پارت هەموو لایەک ئاگاداردەکاتەوە لەوەی کە دەنگی تۆمارکراو سەد لە سەد دەنگی ژێرۆم کاویزاکە و ئەوەشیان لەڕێگای میتۆدە زانستییەکانەوە سەلماندووە. لەهەمانکاتدا کاویزاک لەسەر تەلەفزیۆنەکان، لەبەردەم پەرلەماندا هاواردەکات و دەڵێت: من ڕاستدەکەم و میدیا پارت درۆدەکات.

**• ١٩ مارس ٢٠١٣**

خەبیرەکانی دەزگای پۆلیس دانبەوەدا دەنێن کە ئەگەرێکی زۆر گەورە هەیە کە دەنگی تۆمارکراو هەمان دەنگی کاویزاک بێت. لێرە بەدواوە، دادگا قۆناغی سەرەتایی لێکۆڵینەوەوە دەگوێزێتەوە بۆ قۆناغی تۆمەتی سپیکردنەوەی پارەی ڕەش. لە ئێوارەی هەمان ڕۆژدا، ژێرۆم کاویزاک واز لە پۆستی وەزیریی دەهێنێت و دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە. بەڵام بەردەوام باس لە بەرائەتی خۆی دەکات.

**• ٠٢ ئەڤریل ٢٠١٣**

لەم ڕۆژەدا ژێرۆم کاویزاک، لەبەردەم دادوەرەکاندا دان بە ڕاستییەکاندا دەنێت. دانبەوەدا دەنێت کە تا ساڵی ٢٠١٠ حسابێکی بانکی لە UBS هەبووە و شەش سەد هەزار ئیرۆی لەسەربووە. پاشان لەسەر سایتەکەی خۆی ڕونکردنەوەیەک بڵاودەکاتەوە و داوای لێبوردن لە سەرۆک کۆمار، سەرۆک وەزیران، پەرلەمان و هەموو فەرەنسییەکان دەکات.



ژێرۆم کاویزاک لە ساتەوەختی بەجێهێشتنی وەزارەتەکەی و

ماڵئاواییکردنی لە کێڵگەی سیاسی.

ئەم ڕووداوە نەک هەر کاویزاکی فرێدایە دەرەوەی سیاسەتەوە، بەڵکو کاریگەری لەسەر تەواوی کولتووری سیاسی فەرەنسیەوە دانا. لە ئەمڕۆ بەدواوە، ئەوەی کە دەبێت بە وەزیر، دەبێت فلس بە فلس، خانو، موچە، کۆمپانیا، زەوی، تەنانەت ئەگەر گوێرەکەیەکیشی هەبێت دەبێت ڕاییگەیەنێت و بیخاتە سەر سایتی فەرمی حکومەت بۆئەوەی هەموو هاوڵاتیان بیبینن. ئەمە ئەو دەسەڵاتی سزادانەیە کە ئێمە لەم کتێبەدا باسی دەکەین.

دەسەڵاتی سزادان لەهەمانکاتدا دەسەڵاتی بیرهێنانەوەشە، چونکە نوێنەرە دەنگپێدراوەکان تێدەگەیەنێت کە ئەوان نەک هەر بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لێرەن، بەڵکو لەو ماوە دیاریکراوەشدا دەستیان کراوەنییە و مافی ئەوەیان نییە لەسەر هەموو پەتەکان یاریبکەن. ئەوان لەم ماوە دیاریکراوەدا لێرن بۆئەوەی بەڵێن و پرۆژەکان جێبەجێبکەن و هیچی تر. هەر چوونە دەرەوەیەک لەم چوارچێوەیە چەندین جۆر لە سزادان بەدوای خۆیدا ڕادەکێشێت. لە هەلومەرجێکی ئاوادا، داهاتووی هەر سیاسییەک پابەند دەبێت بە ئاستی ڕێزگرتن لە بەڵێن و پرۆژەکان. حکومەتێکی دیموکراتیک کە شەرعیەتی هەڵبژاردن و نوێنەرایەتیکردنی هەیە، هەمان ئەو حکومەتەیە کە هیچ چرکەیەک دوورنییە لە دەسەڵاتە جۆراوجۆرەکانی «بەرەنگاری» هێزە جیاوازە کۆمەڵایەتییەکان، ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، حیزبەکانی ئۆپۆزسیۆن، دەزگا ئابوورییەکان.

لە کۆمەڵگەی دیموکراتیکی زیندوودا، شوناسی سیاسی چەند بەرهەمی هەڵبژاردنی ئازادانەی نوێنەرانە، هێندەش بەرهەمی دەسەڵاتی چاودێرکردن و ڤیتۆدانانی کۆمەڵگەی مەدەنییە لەسەر بڕیار و پرۆژە لادەرەکانی هەمان نوێنەران. بەبێ دەسەڵاتی ڤیتۆی کۆمەڵگەی مەدەنی، دیموکراسی جگە لە

دەستنوێژێکی شکاو چیدی نییە! دیموکراسی هەڵبژاردن، بەبێ کولتووری دیموکراسی چاودێریکردن، بەبێ کولتووری پەروەردەی دیموکراسی، بەبێ ئامادەیی ڕۆحی دیموکراسی کە ئەلف و باکەی لە تەقدیسکردنی مافەکانی مرۆڤەوە دەستپێدەکات، کۆمەڵگەکان دەباتەوە سەر مۆدێلی ڤەنزوێلای چاڤێز! لەم وڵاتەدا، لە ئەنجامی هەر هەڵبژاردنێکدا چەند مرۆڤێک دەکوژرێن و خوێنیان دەڕژێتە سەر شەقامەکان.

لە ١٤ ئەڤریلی ٢٠١٣ دا و پاش مەرگی چاڤێز دیسانەوە ڤەنزوێلا پرۆسەی هەڵبژاردن ڕێکدەخات. ململانێی هەڵبژاردن لەنێوان چەپ و ڕاستدا دەستپێدەکاتەوە. نیکۆلاس مادورۆ، کۆنە جێگری چاڤێز، بەڕێژەیەکی زۆر کەم هەڵبژاردنەکان دەباتەوە. ڕۆژێک دواتر، لایەنگرانی ڕاسترەوە دۆڕاوەکان، بە هەزاران دەڕژێنە سەر شەقامەکان و نایانەوێت دان بە سەرکەوتنی چەپدا بنێن. لە ئەنجامی بەریەک کەوتنیان لەگەڵ دەزگاکانی پۆلیسدا حەوت مرۆڤی ڤەنزوێلی بە مەرگ دەسپێردرێن و شەست و یەک کەسیشیان لێ بریندارەبێت، و بەلای کەمەوە سەد و سی و پێنج کەسیش بەرەو زیندانە تاریکەکان دەبرێن.



کاراکاسی پایتەختی ڤێنزیولا، پاش هەڵبژاردن.

سەرۆکی ڕاستڕەوەکان، هنریک کاپریلێس ڕاستەوخۆ دەسەڵات تاوانباردەکات و پێیوایە خودی نیکۆلاس لە پشت دارشتنی پلانی زەبروزەنگ و خوێنرشتنەوەیە. سەرۆکی هەڵبژێردراو، نیکۆلاس مادورۆ، لەسەر هەمان میتۆدی هیگۆ چاڤێز، دیسانەوە بەرامبەرەکانی بە «فاشیست» و «کودەتاچی» ناودەبات و سیفەتی ناپاک و نۆکەری بێگانەیان دەخاتە پاڵ و هاوردەکات:

«ئەوان سەری منیان دەوێت؟ دەبا بێن بەدوامدا بگەڕێن و بمدۆزنەوە، ئەوان چاک دەزانن من لە کوێم. گەر ئازان بابێن بەدومدا بگەڕێن! من لێرەم، گەلێکم بەدواوەیە، سوپایەکم لەبەردەستدایە، گەر پیاون با بێن و بەدوامدا بگەڕێن![٢٥]».

پاش ئەم لێدوانانە، چەندین بارەگای حیزبەکان لە چەپ و ڕاست سوتێنران و کاراکاسی پایتەخت بوو بە مەیدانی پێکدانان و بەریەکەوتن.

من بێ هیچ ڕاراییەک، بێ هیچ پێچ و پەنایەک ڕاستەوخۆ دەڵێم: هەموو ڕژێمە کانی جیهان، بە ئاسمانی و دنیاییەوە، بە دیموکراسی وتیۆکراسی و دیکتاتۆرییەوە، ئەو چرکە ساتەی کە بوون بە هۆکاری کوشتنی مرۆڤێک ئیتر دەبێت گومانیان لەسەر دروستبکرێت. لەنێو هەموو ڕژێمە مێژووییەکاندا، بۆیە دیموکراسی دەکرێت جێگای ڕەزامەندیی بێت، چونکە تەقدیسی مافەکانی مرۆڤ دەکات، بەڵام ئەو چرکەیەی بەناوی دیموکراسییەوە مرۆڤ دەکوژرێت، خوێنی دەرژێتە سەر شەقامەکان، زیندانی دەکرێت، لە هەلومەرجێکی ئاوادا دەبێت سەرلەنوێ شتەکان

[25] Le Monde, 15 avril 2013.

ڕاکێشینەوە نێو تاقیگە زانستییەکانەوە و بیانیشکێنینەوە، بۆئەوەی تێبگەین سەرچاوەی کارەساتەکە لەکوێدایە.

لە کاتێکدا سەرۆکی وڵاتێک، وەک نیکۆلاس مادورۆ، بەناوی شەرعیەتی دیموکراسییەوە دەگاتە دەسەڵات و وەک شەقاوەیەک قسەدەکات، گەر بێت و ئەو میکانیزمانەی دژە-دیموکراسی کە ئێمە لەم کتێبەدا باسیاندەکەین ئامادەنەبن، زۆر بە ئاسانی پەڕینەوە بۆ دیکتاتۆریەت و بەجێهێشتنی دیموکراسی دەبێت بە بەهێزترین گریمانەی ترسناک.

# بەشی دووەم
# چاودێریکردنی دیموکراسی

- یەکەم: میکانیزمی وریابوون.
- دووەم: میکانیزمی ڕەخنەگرتن.
- سێیەم: میکانیزمی نمرەبەخشین.

دیموکراسی چەمکێکی لاستیکی نییە و لەنێو «تەجرید»دا کارناکات، بە پێچەوانەوە چوارچێوەیەکی کۆنکرێتی هەیە و ئەو چوارچێوەیەش بە کۆمەڵێک بنەماوە دەناسرێتەوە. یەکێک لەو بنەما سەرەکییانەش بریتیە لە کردەی هەڵبژاردنی کۆمەڵێک ئەکتەری سیاسی کە بڕیارە نوێنەرایەتی خەون، بەرژەوەندی، ئارەزوو، ئومێد و چاوەڕوانییەکانی گروپە جیاوازە کۆمەڵایەتییەکان بکەن.

تائێرە ئێمە لە ڕووبەری بەڵگەنەویستداین و شتەکان تەواو ئاساین. بەڵام لەو ساتەوەختەوە کە گومان لەم ئەکتەرە هەڵبژێراوانە دەکەین، ئیتر شتەکان ڕەهەندی بەڵگەنەویست لەدەستدەدەن و ئاڵۆزدەبن. کۆمەڵگەی مەدەنی دەنگدەر، دەتوانێت چیبکات بۆئەوەی ئەکتەرە سیاسییە دەنگپێدراوەکانی ئەمڕۆ، لە سبەینێیەکی نزیکدا، نەبنەوە بە ئەکتەرە سیاسییە گەندەڵ و گومڕاکانی دوێنێ؟، دەتوانێت چی بکات بۆئەوەی ئەکتەرە سیاسییە دەنگپێدراوەکانی ئەمڕۆ، لە سبەینێیەکی نزیکدا، نەبن بە توێژێکی ئەرستۆکراتی لەخۆگۆڕاوی بێ یادەوەری و بێ هەست؟، کە هەموو بڕیارە چارەنوسسازەکانی ئەندامانی کۆمەڵگەیەک (بڕیاری دەسەڵاتی کڕین، بڕیاری جەنگ و ئاشتی، بڕیاری دۆزینەوە یان لەدەستدانی کار، بڕیاری گەشەکردن یان قەیران، بڕیاری دادپەروەری یان ستەمکاری،...) لەدەستی سەرۆکێک، سەرۆک وەزیرانێک و چەند وەزیرێک یان چەند ئەندامێکی پەرلەماندا بێت، کۆمەڵگەی مەدەنی دەتوانێت چی بکات بۆئەوەی ئەم نوخبەیە پارێزراوبن لەوەی کە یاری بە چارەنوسی بکەن؟. کۆمەڵگەی مەدەنی دەتوانێت چی بکات بۆئەوەی شۆڕشگێڕەکانی دوێنێ، کە بەناوی شەرعییەتی دیموکراسییەوە جەنگی مان و نەمانیان لەگەڵ دیکتاتۆرییەتدا دەکرد، ئەمڕۆ کە بەڕێگای هەڵبژاردن گەشتونەتە

دەسەڵات، لە سبەینێیەکی نزیکدا، نەبنەوە هەمان ئەو دیکتاتۆرەی ڕوبارێک خوێنیان لەپێناوی قەڵاچۆکردنیدا بەخشی؟. چی بکرێت بۆئەوەی سبەینێیی دیموکراتێک نەبێت بە ڕەوتی بیناکردنەوەی «ئەویتری» دیکتاتۆر؟. چی ڕێگا لەوەدەگرێت کە هەڵبژێردراوێک گەندەڵترنەبێت لە خۆسەپێنەرێک؟. ئایا کردەی هەڵبژاردن بەسە بۆئەوەی کە هەڵبژێردراو ببێت بە نمونەی دەستپاکی و لێبوردەیی؟.

بێگومان نەخێر!.

کەوەڵامەکەمان نەخێر بێت، ئیتر لەم ساتەوەختەوە ئیشکالییەتی چاودێریکردنی هەڵبژێردراوەکان لەلایەن کۆمەڵگەی مەدەنییەوە دێتەوە پێشەوە و خۆی بەسەر هەموو ئەو ڕژێمانەدا کە هەڵگری سیفەتی دیموکراتن فەرزدەکات. دەسەڵاتی چاودێریکردن، ئەو هێزە کارایە کە دەتوانێت تیشک بخاتە سەر ناوچە لاوازەکانی سیستەمی نوێنەرایەتیکردن، دەتوانێت ڕێگا بۆ چونەدەرەوە لە ڕەشبینی دەستنیشانبکات و هەلومەرجی دروستکردنی متمانە ئامادەبکات.

لە ڕژێمە نادیموکراتەکاندا نوخبەی دەسەڵاتدار هەموو میکانیزمەکانی چاودێریکردنی کۆمەڵگە، جومگە بە جومگە، ناوچە بە ناوچە، بست بە بست، تاک بە تاک دەخاتە کار و ڕووبەرێک، هیچ ڕووبەرێک بەبێ چاودێری ناهێڵێتەوە، چونکە دەترسێت لە هەر چرکەیەکدا ڕووبەری فەرامۆشکراو ببێت بە لانکەی یاخی بوون و تەقینەوەکان. لەڕژێمە دیموکراتەکاندا، ئەم هاوکێشەیەش بە گۆشت و ئێسقانەوە ئامادەیە، بەڵام بەپێچەوانەوە. واتە کۆمەڵگەی مەدەنی جومگە بە جومگە، ناوچە بە ناوچە، بست بە بست، تاک بە تاکی نوخبەی دەسەڵات دەخاتە ژێر چاودێرییەوە و هیچ ڕووبەرێک ناخاتە ئەو دیوی کردەی

چاودێریکردنەوەوە، چونکە لە هەر ساتەوەختێکدا دەکرێت لەو ڕووبەرەدا لادانی گەورە ڕووبدات.

لەڕژێمی نادیموکراتــدا ســەرۆک یــان حیزبــی تۆتالیتــار (شـمولی) سەرچاوەی «سەروەری/سیادە»یە و هەمـوو شتەکان یان لە سـەرۆکەوە، یـان لە حیـزبەوە شـەرعییەت وەردەگـرن. بەڵام لە ڕژێـمە دیموکراتەکانـدا تەنهـا هاوڵاتیـان، واتە کـۆمەڵگەی مەدەنــی، ئەوەی جـاران پێیـدەوترا «گەل» سـەرچاوەی سـەروەری و شـەرعییەتە. لێـرەوە دەسـەڵاتی چـاودێریکردنی کـۆمەڵگەی مەدەنــی بەسـەر نـوخبەی دەسـەڵاتدا، لە دیموکراسی هەمیشەییدا، نەک جێگای پرسیار نییە، بەڵکو بۆ بەردەوامی خودی سیستەمەکە پێداویستییەکی چارەنوسسازە.

ئێسـتا کـاتی ئەوەهـاتووە بپرسـین: پـاش گەیشـتن بەم دەرئەنجـامە، لەسەر ئاستی پراکتیکی، دەسەڵاتی چاودێریکردن لە چی پێکدێت و چۆن دەتوانێت مومارەسەی خۆی بکات؟.

لە کـۆی ئەو میکانیزمـانەی کە زانسـتە کۆمەڵایەتییەکـان بەگشـتی و پیەر ڕۆزانڤـالۆن بەتـایبەتی پێشـنیاریان دەکەن و باسـیان لێـوەکردوون[٢٦]، ئێمە تەنها سیانیان هەڵدەبژێرین و هەر یەکێـک لەم سێ میکـانیزمە، نەک هەر کـارا و چـالاکن، بەڵکـو بەتەواوی لەگەڵ هەلـومەرجی ئەو شتەشـدا دەگونجێن کە ناومان نا «دیموکراسی کـوردی[٢٧]» و دەکرێـت بەم شـێوەیە ڕیزبەندیان بکەین:

---

[26] Pierre Rosanvallon, *La contre-démocratie, la politique à l'âge de la défiance*, Seuil, Paris, 2006.

[٢٧] بێگومـان ئاگـام لەو گوفتوگـۆیە هەیە لەسـەر ئەوەی کە ئایـا لە کوردسـتاندا دیموکراسـی هەیە یـان نـا. دەزانـم چەنـد نووسـەرێکی ڕەخنەگـری ڕادیکـاڵ، کە تـا

- میکانیزمی وریابوون.
- میکانیزمی ڕەخنەگرتن.
- میکانیزمی نمرەبەخشین.

لە ئێستا بەدواوە هەر یەکێک لەم سێ میکانیزمەی کە دەسەڵاتی چاودێری کۆمەڵگەی مەدەنی بەسەر نوخبەی دەسەڵاتەوە پێکدەهێنن، دەپشکنین و ڕایاندەکێشینە نێو هۆڵی تاقیکردنەوەی پرسیارە بابەتییەکانەوە.

---

ئێستاش لە ژێر کارایی فیکری نەوە فەلسەفییەکەی مایسی شەست و هەشتی فەرەنسیدان (میشێل فوکۆ، جاک دێریدا، جیل دۆلۆز، ژان فرانسوا لیوتار، پیەر بۆردیۆ)، بەتوندی ئەوە ڕەت دەکەنەوە کە لە کوردستان دیموکراسی هەبێت. بەڵام من لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا نیم. ڕاستە ئەو دیموکراسییەی لە فەرەنسادا هەیە، لە کوردستاندا نییە، بەڵام ئەوەش ڕاستە کە سیستەمێکی دیموکراتیکی تایبەت بە هەلومەرجی کولتووری و کۆمەڵایەتی کوردستانی لە دروستبووندایە. ڕاستە ئەم سیستەمە سەدان کون و کەلەبەری تیادایە، بەڵام ئەوەش ڕاستە کە شتێک بەناوی دیموکراسی کوردییەوە دادەمەزرێت. من پێموایە خۆ دوورگرتن لە بینی ئەم واقیعە نوێیە سیاسییە، جۆرێکە لە تەمەڵی فیکری و دوورکەوتنەوە لە توێژینەوەی مەیدانی قووڵ. واتە ئاسانە ڕۆشنبیرێک لە پەنای چەند کۆنسێپتێکدا خۆی بشارێتەوە و زەرب لە کۆی واقیعێک بدات ، بەڵام خوێندنەوەی ئەم واقیعە وەک ئەوەی کە هەیە کارێکی ئاسان نییە و پێویستی بە کات و خۆماندووکردنە. بێگومان ڕۆشنبیری کوردیش لە زۆر حاڵەتدا نەکاتی هەیە و نە خۆشی ماندوودەکات.

# (١)

# هاوڵاتی وریا

لە سیستەمی دیموکراتیکدا جیاوازییەکی گەورە لەنێوان چەمکی هاوڵاتی و چەمکی «مێگەل»دا هەیە. چەمکی مێگەل بۆ ئەو کۆمەڵگایانە بەکاردەهێنرێت کە خاوەنی سیستەمێکی سیاسی/کۆمەڵایەتی دیموکراتیکنین. «مێگەل» لە ئەندامانی ئەو کۆمەڵگەیە پێکدێت کە فەرماندە، سەرۆک، فەرمانڕەوایەکیان هەیە و وەک شوان مامەڵەی لەگەڵدادەکەن. کۆمەڵگەی مێگەل لەو مرۆڤانە پێکدێت کە پێیانوایە سەرۆک لەبری هەمووان بیردەکاتەوە، لەبری هەمووان ستراتیژ دادەنێت، لەبری هەمووان بڕیاردەدات، لەبری هەمووان دنیای سیاسی و کۆمەڵایەتی ڕێکدەخات. سەرۆک لە هەموو لایەک پاکترە، پیرۆزترە، جوانترە، داناترە، زاناترە، سیاسیترە. سەرۆک هەموو سیفەتەکانی لە «ترانساندان[28]»وە

[28] ترانسانداس واتە سەری سەرەوە، ئاسمان، دنیای غەیب، هەموو ئەو شتانەی لەو ڕوبەرەوە دێنە خوارەوە. ئەم چەمکە لەلایەن هەموو زانستە کۆمەڵایەتییەکانەوە بەکارهاتووە. دۆرکایم پێیوایە خوداوەند لەسەرەتادا لەنێو ئیمەنانسدا دروستدەبێت؛ واتە لە خوارەوە، لێرە، لە ئێستای بەشەرەکاندا، لە دنیادا. بەڵام دواتر مرۆڤەکان مەودا لەنێوان خۆیان و ئەوی دروستکراودا دروستدەکەن و بۆ ئاستی

وەردەگرێت و ئێمە کە لەنێو «ئیمەنانس»دا دەژین دەبێت هەمیشە چاوەڕێی دەستی میهرەبانی ئەوبین.

کۆمەڵگەی هاوڵاتی، تەواو بەپێچەوانەی کۆمەڵگەی مێگەلەوە ڕەفتاردەکات. سەرۆک، دەسەڵات، پەرلەمان، حکومەت لەنێو ئێستا و ئێرە دنیاییەکاندا، لەنێو هەلومەرجە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی ئێستا و ئێرەدا دروستدەبن و کۆتایشیان پێدێت. مرۆڤی ئەم کۆمەڵگەیە «مێ»یەک نییە لە مێگەلێک، بەڵکو هاوڵاتیەکی هەمیشە بە خەبەرە، هەمیشە زیندووە، هەمیشە لەسەرپێیە، هەمیشە وریایە و بەوریاییەوە لە پرۆژە، لە جوڵانەوە، لە جێبەجێکردنی ئەو کەسانە دەڕوانێت کە لەڕێگای هەڵبژاردن و نوێنەرایەتیکردنەوە گەیشتونەتە ناوچەکانی دەسەڵات. ئەم هاوڵاتییە چاوەڕوانی میهرەبانییەکانی دەسەڵات نییە، بەڵکو دەسەڵات بە خزمەتگوزاری خۆی دەزانێت، تواناکانی بیرکردنەوەی بە دەسەڵات ناسپێرێت، بەپێچەوانەوە، لە هەموو چرکەیەکدا بەکاریاندەهێنێت؛ بۆ ئەوەی خودی دەسەڵات تێبگەیەنێت لەوەی کە دەسەڵاتێکی دیکە، بۆ چاودێریکردنی، هەمیشە لێرەیە.

ئەم هاوڵاتیە، کە لەهەمانکاتدا ئەکتەری یەکەمی ژیانی خۆیەتی، بەرپرسیاری یەکەمی چانسەکانییەتی، بیناکاری یەکەمی داهاتویەتی؛ ئامادەنییە چوار ساڵ جارێک بڕواتە بەردەم سندوقێکی بێ گیانی دەنگدان و کاغەزێکی بێگیان پڕبکاتەوە و واژۆیەک بکات و تەواو. ئامادەنییە تا چوار ساڵی دیکە چاوەکانی داخات، گوێچکەکانی کەڕکات، بیرکردنەوەی سڕبکات و

---

ترانسانداسی بەرزدەکەنەوە. کاتێک لەوێوە دێتەوە بۆ نێو مرۆڤەکان، ئیتر سیفەتەکانی ئەو بەرزاییە بەخۆی دەبەخشێت و خۆی بەسەر هەمووڵایەکدا فەرزدەکات.

دنیا کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکەی بە نوێنەرەکان بسپێرێت. بەپێچەوانەوە، پەروەردەی دیموکراسی وایلێدەکات لەیەککاتدا دەنگ بە نوێنەرێک بدات و کۆنترۆڵیشی بکات. کە مرۆڤی هەڵبژێردراو مارێکی هەمیشەیی بێت بۆ پێوەدان، ئاگرێکی هەمیشەیی بێت بۆ سوتان، ئارەزوویەکی هەمیشەییبێت بۆ لادان، ئیتر چۆن هاوڵاتی دیموکراتیک دەتوانێت دەست لە دەسەڵاتی چاودێری و کۆنترۆڵکردنی هەمیشەیی هەڵبگرێت!.

دوو سەد و بیست و شەش ساڵ لەمەو پێش، شۆڕشگێڕە فەرەنسییەکانی ساڵی ١٧٨٩ دەیانوت: گەلێکی ئازاد ئەو چاودێرە بەردەوامەیە کە هەموو شتێک دەبینێت، هەموو شتێک دەبیستێت، لە هەموو شوێنێکە و هەرگیز ناخەوێت[٢٩]. کێ دەتوانێت بڵێت لە ڕژێمە دیموکراسییەکانی دنیای ئێستاماندا، بە دیموکراسی کوردیشەوە کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە ئێمەوە هەیە، زیاتر لە هەر کاتێکی دیکە ئێمە پێویستمان بەم پرەنسیپە نییە! کۆمەڵگەی پێکهاتوو لە هاوڵاتی وریا، لەهاوڵاتی هەمیشە بە خەبەر، چیتر ئەو کۆمەڵگە «خەوتووە» نییە کە واقیعی کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئابووری خۆی نەبینێت، بەڵکو ئەو کۆمەڵگەیەیە کە لە هەر چرکەیەکدا دەتوانێت هەستێتە سەرپێ و چارەنوسی ڕووداوەکان دیاریبکات. ڕەنگە دەستەواژەیەک کە بتوانێت گوزارشت لە دۆخی ئەم کۆمەڵگەیە بکات، بریتیبێت لە: کۆمەڵگەی هەمیشە لەسەر پێ!، وەک چۆن تفەنگی لەسەر پێ، هەمیشە ئامادەی تەقەکردنە، ئاواش کۆمەڵگەی لەسەر پێ، هەمیشە ئامادەی چاودێریکردنە.

---

[29] Anacharsis Cloot, *Ecrits révolutionnaires (1790-1794)*, Champ libre, 1979, p.110. In Pierre Rosanvallon, *La contre-démocratie, la politique à l'âge de la défiance*, Seuil, Paris, 2006, p.39.

هاوڵاتی هەمیشە لەسەر پێ، مەرج نییە ئەندامی حیزبێکی ئۆپۆزسیۆن بێت، نەک هەر مەرج نییە، بەڵکو ئەو هاوڵاتییەی کە ئێمە باسی دەکەین لە خراپترین هەلومەرجدا ئەندامی حیزبێکی ئۆپۆزسیۆنە و لە هەلومەرجی ئاساییدا ئەکتەرێکی سەربەخۆی بێ بڕیاری پێشینەیە. ئیشی سەرەکی لەسەرپێبوونی بریتیینییە لە هەڵوەشانەوەی دەسەڵات، بردنەوەی هەڵبژاردن، گوررزدان لە حکومەت، ئابڕووبردنی وەزیرەکان، پاشقولگرتن لە سەرۆک، نەخێر ئیشی سەرەکی ئەم هاوڵاتییە بریتییە لە «ئامادەبوونی» لەنێو پانتاییە سیاسییەکاندا، ئامادەبوونێکی ئیجابییانە کە ڕێگاییێدەدات بەشداری لە دامەزراندن و پتەوکردنی بنەماکانی دیموکراسی لە کۆمەڵگەدا بکات.

هەمیشە لەسەرپێبوون واتە بیرخستنەوەیەکی بەردەوام، واتە قسەکردن لەگەڵ یادەوەری دەسەڵاتدارانداا کە «من»ی هاوڵاتی هەمیشە لێرەم و چاودێریت دەکەم، واتە «تۆ»ی دەسەڵات ناتوانیت بەبێ «من»ی هاوڵاتی ببیت بە خاوەنی شەرعیەت و پانتایی گشتی دروستبکەیت. ئەمەش یەکێکە لەو هێڵە تۆخانەی کە سنووری ئۆپۆزسیۆن و کۆمەڵگەی مەدەنی لەیەکتری جیادەکاتەوە. کۆمەڵگەی مەدەنی هەروەک چاودێرە بەسەر حیزبە دەسەڵاتدارەکانی ئەمڕۆوە، ئاواش لە سبەینێیەکی نزیکدا دەبێت بە چاودێر بەسەر ئۆپۆزسیۆنی ئەمڕۆوە کە سبەینێ دەکرێت بگاتە دەسەڵات. واتە ئەوەی لێرەدا جێگیرە، دەسەڵاتی چاودێریکردنی کۆمەڵگەی مەدەنییە، چونکە «ڤاریابڵەکانی دیکە [ئۆپۆزسیۆن و دەسەڵات]» لە گۆڕانی هەمیشەییدان و دەسەڵاتداری ئەمرۆ ئۆپۆزسیۆنی کاتیی سبەینێیە.

بەپێچەوانەی حیزبەکانی ئۆپۆزسیۆنەوە کە پێیانوایە ئەم جۆرە لە چاوێدریکردن بە ئاسانی لەلایەن دەسەڵاتەوە ماڵیدەکرێت، چونکە هەڵگری

سروشتێکی دەستەمۆکراوە، ئێمە پێمانوایە ئەم چوارچێوەیە بەشێکە لە «ئەکسیۆن[٣٠]»ێکی زیندوو، جوڵاو، بەخەبەر، وشیار و بە ئاسانی خۆی

---

[٣٠] ئەکسیۆن لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا بریتیە لە دەرکەوتنی مادی یان ڕەمزی خواستی تاکێک یان گرووپێک لە دۆخێکی کۆمەڵایەتیدا. هەر دەرکەوتنێکی ئەم خواستە، لەسەر ئاستی مادیدابێت یان ڕەمزی، لە دۆخێکی کۆمەڵایەتیدا دەکرێت بە ئەکسیۆن ناوبنرێت.

چەمکی ئەکسیۆن یەکێکە لە چەمکە هەرە بەهێزەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان. یەکێکە لەو قووتبە بەهێزانەی کە بەدەوریدا دەسوڕێتەوە. مەیدانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان بەپێی ئەو مانایانە دەگۆڕێت کە دەدرێن بەم چەمکە.

سانت سیمۆن، هەر لەسەرەتای دەستپێکردنی سۆسیۆلۆژیاوە گرنگیەکی تەواوی بە چەمکی ئەکسیۆن داو کردی بە سەنتەری کارکردنی. بەتایبەتی لەو کاتەوە کە ناڕەزایی خۆی لەسەر پێناسەکردنی کۆمەڵگە وەک ڕێکخستنێکی سرووشتی دەربڕی و ئەو پێیوابوو ئەمە هەڵەیە، چونکە کۆمەڵگە پێش هەموو شتێک ڕێکخستنێکی مێژووییە و ئەم تێزەشی پشتئەستوور دەکات بەو ئەرگیومێنتانەی کە لە شۆڕشی فەرەنسییەوە وریگرتن. ئەو کلیک لەسەر هەموو ئەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییانە دەکات کە شۆڕشی فەرەنسی بەسەر کۆمەڵگەیدا هێناو هەموو ئەمانەش دەبەستێتەوە بە چەمکی ئەکسیۆنەوە.

دواتر دوو ترادیسیۆنی گەورە لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا دێن و بە دوو شێوەی جیا، بە دوو مانای جیا، بە دوو لێکدانەوەی جیا باس لە چەمکی ئەکسیۆن دەکەن. ترادیسیۆنی یەکەم لە مارکسەوە دەستپێدەکات و بە دۆرکایمدا تێدەپەڕێت و لە پیەر بۆردیۆدا دەگاتە لوتکە. ترادیسیۆنی دووەم لە ماکس ڤێبەرەوە دەستپێدەکات و بە ئەلفرێد شووتزدا تێدەپەڕێت و لە گۆفماندا دەگاتە لوتکە.

قوتابخانەی یەکەم ئەکسیۆن چ لەسەر ئاستی تاک و چ لەسەر ئاستی گرووپ دەخاتە نێو "دیتێرمینیزم"ێکی بەهێزەوە. واتە لەهەردوو ئاستەکەدا ئەکسیۆن هیچ نییە

بەرهەمی ئەو ستراکتۆرە کۆمەڵایەتییانە نەبێت کە لە نێو مێژووی تاکێک یان گروپێکدا دروستبوون.

قوتابخانەی دووەم، تەواو بەپێچەوانەی "دێتێرمینیزم"ەوە، پێیوایە کە ئەکسیۆن لە ئێستا و ئێرەیەکی تایبەتدا دروست دەبێت و مرۆڤ بە شێوەیەکی ئازادانە دایدەڕێژێت و پڕی دەکات لەمانا.

بێگومان ئەم جیاوازییە چیرۆکێک لە جیاوازی مێتۆدۆلۆژیاش بەدوای خۆیدا ڕادەکێشێت. لەکاتێکدا کە کارکردنی دۆرکایم دەبێت بە سۆسیۆلۆژیای شەرحکردن، کارکردنی ڤێبەر دەبێت بە سۆسیۆلۆژیای تێگەشتن.

لەکاتێکدا بۆردیۆ کلیک لەسەر ئەو ستراکتۆرانە دەکات کە چوارچێوەکانی ئەکسیۆن دیاریدەکەن، گۆفمان تیشک دەخاتە سەر ئەو ئێستا و ئێرانەی کە ئەکسیۆنی تیادا بەرهەم دێت.

بۆردیۆ دەڵێت: "ئەکسیۆن زۆرجار لە نێو مانای پراکتیکدا خۆی دەبینێتەوە و کەمتر دەڕواتە نێو چوارچێوەیەکی عەقڵانییەوە". لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ئەکسیۆنی بکەرە کۆمەڵایەتییەکان گوزراشت نین لە ئینعیکاسییەتی ئامادەباشی Réflexive de disposition، لە ئینعیکاسییەتی هابیتیوسێک کە لە نێو کێڵگەی پراکتیکدا بەدەست هاتووە. بۆردیۆ دەیەوێت بڵێت کە ئەکسیۆن، وەک مەیدانی توێژینەوەی سۆسیۆلۆگ، نە کاردانەوەی رووتوقوتە نە عەقڵانییەتی رووتوقوت.

لە ڕێگای بوونیەکانی پەیوەندییەوە cognitive Structure هابیتیوس دێت و پێمان دەڵێت ئێمە دەتوانین چی بکەین و چی نەکەین، واتە هابیتیوس سەرلەبەری ژیانی ئێمە داگیردەکات و لەهەموو چرکەیەکدا ئاراستەی رەفتارەکانی ئێمە دیاریدەکات.

بۆردیۆ پێی وایە کە بکەرەکان بەبێ ئامانج ناجوڵێنەوە، بەڵام ئەمە مانای ئەوەنییە کە ئەو بکەرانە کائینی عەقڵانین و بۆ هەر کردەیەک پێوانەکانیان ئامادەدەکەن و بست بە بست رەفتارەکانیان دەپێون و هەنگاوەکانیان دەژمێرن. ئەو پێیوایە سەرچاوەی ئەکسیۆنەکانی بکەرە کۆمەڵایەتییەکان لە هەرێمی دیکەدان نەک لە نێو عەقڵی ژماردندا، ئەو هەرێمەش بریتییە لەو پانتاییەی کە دەبێتە مەیدانی ململانێی

نادات بەدەست ئۆپۆزسیۆن و دەسەڵاتەوە. ئێمە چەمکی «ئەکسیۆن» لەبەرامبەر چەمکی «مەنگبوون»دا بەکاردەهێنین. گەر مەنگبوون بریتیبێت لە وەستانێکی سارد، ئەوە «ئەکسیۆن» بریتییە لە جوڵانێکی گەرم و هەمیشە لەو شوێنەیە کە چاوەڕوانی ناکەین.

ئەم چوارچێوەیە، لەدەرەوەی ئینتیما بۆ حیزبەکانی دەسەڵات و حیزبەکانی ئۆپۆزسیۆن، ڕووبەرێکی دیکە لە کردەی سیاسی دەخاتە بەردەست ئەو هەزاران هاوڵاتیەی کە دەیانەوێت لە سیاسەتکردندا

---

نێوان سیستەمی ئامادەباشی بەدەستهێنراوی بکەرەکان لە لایەک و ناوەندە کۆمەڵایەتییەکان لە لایەکی دیکەوە. واتە هابیتیوس.

ئەم تیۆرەی بۆردیۆ تەواو دژە بە (تیۆری ئەکسیۆنی عەقڵانی) کە پێیوایە کردە لەسەر خواست و هۆشیاری ئەکتەری کۆمەڵایەتی دادەمەزرێت و ئەکتەر بەو پەڕی وشیارییەوە کردەکانی بەرهەم دێنێت و هەموو کردیەکی ئامانجێکی لە پشتەوەیە و هەموو هەنگاوێکی بەمەتر دەپێوێت و دەزانێت لەکوێوە دەستپێدەکات و لەکوێدا کۆتای پێدێنێت.

بۆردیۆ بەتوندی دژی ئەم تیورە دەوەستێتەوە و پێیوایە ئەکسیۆنی کۆمەڵایەتی بکەرێک پێچراوە لە هەموو مێژووی ئەو بکەرە. وە کردەی کۆمەڵایەتی بە پێی بەرژەوەندییەکانی ئێرە و ئێستا بەرهەم نایەت. ڕاستە بکەر لە ئێرە و ئێستایەکدا دەجوڵێت و کردە بەرهەمدێنێت، بەڵام ئەو پرۆسەی بەرهەمهێنانە مەحکومە بە مێژووی ئەو تاک و گروپە و ئەو مێژووە بۆ یەک چرکەش لێیان غافڵ نابێت. واتە ڕاستە من لە ئێرە و ئێستادا کار دەکەم، بەڵام من مێژوویەکیش بەدوامەوەیە کە کارکردنی من لە ئێرە و ئێستادا دیاری دەکات. تەواو بە پێچەوانەی ئەنتەرئەکسیۆنیستەکانی وەک گۆفمان و ئیتنۆمیتۆدۆلۆگەکانی وەک گارفینکەلەوە، کە پێیان وایە ئەکتەری کۆمەڵایەتی منداڵی ئێستا و ئێرەیەتی و ئازادە لەو مێژووەی کە ناتوانێت خواستەکانی هەنووکە پێوەند بکات.

بەشدارین، بەبێ ئەوەی هەڵگری شوناسی حیزبێکی دیاریکراوبن. گەر لەنەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا، لەژێر زەبری قەیرانە ئابوورییە سەختەکانی عێراق و کوردستاندا [هەرچەند بەهیچ شێوەیەک ناتوانین کۆی هۆکارەکان لە ئابووریدا کورتبکەینەوە، بەڵام دەتوانین ئابووری وەک ڕەهەندێکی سەرەکی باسبکەین]، بۆ ئەوەی بتوانن ململانێ لەگەڵ برسێتیدا بکەن، هاوڵاتیان ناچاربووبن، پۆل پۆل، ببن بە ئەندامی حیزبە کوردییەکان، بێگومان لە ساڵی ٢٠٠٣ وە دیاردەی وازهێنان لە هەمان ئەو حیزبانە لە ئاستی ماکرۆ سۆسیۆلۆژیدا تێبینی دەکرێت. هەرچەند ئێمە ستاتیستیکی وردی ئەندامانی حیزبەکانمان لەبەردەستدانییە، بەڵام ئەو ئامارانەی کە پارتی و یەکێتی دەینێرن، ژمارەی ئەندامانی هەموو حیزبەکانی دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆن زۆر کەمترە لەوەی کە تەواوی کۆمەڵگە بگرێتەوە. بەپێی ستاتیستیکەکانی دەزگای ئاماری حکومەتی هەرێم[٣١]، لە ساڵی ٢٠١٠ دا ژمارەی شارنشینەکانی کوردستان گەشتوەتە ٣٨٧١٤٢٥ و ژمارەی گوندنشینەکانیش بریتیە لە ١٠٣٨٤٥٩ و کۆی هەردوو لاش یەکسانە بە ٤٩٠٩٨٨٤. گەر ژمارەی ئەندامانی حیزبەکانی دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆن بگاتە ملیۆن و نیوێکیش، نزیکەی سێ ملیۆن و نیو هاوڵاتی لە دەرەوەی ڕووبەرەکانی سیاسەتکردنی حیزب دەمێننەوە!.

٣١ بۆ زانیاری زیاتر و بینی نەخشەکان خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە سەر ماڵپەڕی فەرمی دەزگای ئاماری حکومەتی هەرێمی کوردستان. http://www.krso.net/

**ژمارەی دانیشتوانی( شارنشین_گوندنشین ) هەرێمی کوردستان بۆ ساڵی ٢٠١٠**



بەپێی ئەو توێژینەوە مەیدانییەی ٢٠٠٨، کە پێشتر بەدرێژی ئامارەمانپێدا، هەڵهاتن لە حیزب، گەڕان بەدوای سەربەخۆییدا، دروستکردنی مەودای ڕەمزی و جوگرافی لەگەڵ حیزبدا، سنورەکانی پەراوێز بەجێدەهێڵێت و دەبێت بە دیاردەیەکی کۆمەڵگەیی هەستپێکراو و تێبینکراو. یەکێک لەو پرسیارانەی کە ئاراستەی جەماوەری کارلەسەرکراو کراوە بەم شێوەیەیە: ئایا دەتەوێت ببیت بە ئەندام لە حیزبێکی سیاسیدا؟ حەفتا و نۆ لە سەدی وەڵامدەرەوەکان دەڵێن نەخێر و تەنها بیست و یەک لە سەدیان دەڵێن بەڵێ. (بڕوانە گرافیکی ژمارە ٤).

هەر بەدوای ئەم پرسیارەدا ڕاستەوخۆ پرسیارێکی دیکە لەسەر هۆکارەکانی پشتکردنە حیزبی سیاسی لە کوردستاندا دەکەین و دەپرسین: ئەو ڕێگرانە چین کە واتلێدەکەن کە نەبیت بە ئەندام لە حیزبێکی سیاسیدا؟ هۆکاری یەکەمی پشتکردنە حیزب بریتیە لە گەندەڵی (٢٢٪)، بەدوای هۆکاری خراپی دەسەڵاتی سیاسی کوردی و شکستە یەک لەدوای یەکەکانییەتی (١٩٪). ئەوانەی بەتەواوی بڕوایان بە کاری سیاسی نەماوە بە پلەی سێیەم دێن (١٠٪). ( بڕوانە گرافیکی ژمارە ٥).

موراد، لاوێکی کوردە، تەمەنی چلساڵە، لە هەڵەبجە لە دایکبووە، لە سلێمانی ژیانی بەسەر دەبات، هەڵگری بڕوانامەی بەکالۆریۆسە، چوار خوشک و دوو برای هەیە، بەم شێوەیە گوزارشت لە بێ متمانەیی خۆی بەرامبەر بە سیاسەت لە کوردستاندا دەردەبڕێت:

**«سیاسەت لای من فەنی مومکینە، هونەری بەڕێوبردنی ژیانە، هونەری سیستتماتیزەکردنی ژیانە. بەڵام بەداخەوە لای ئێمە سیاسەت بووە بە جۆرێک لە بازرگانی خراپ بەسەر دابەشکردنی خەونی نیشتمانی خەڵکەوە. سیاسەت**

لای ئـێمە تەفسـیرێک یـاخود وێنـاکردنێکی ناشـیرینی وەرگرت. ئەوەش وایکرد کە لەدوای ڕاپەڕین نەوەیەکی گەنج لەدەرەوەی سیاسـەت کـار دەکەن و ئینتیمایـان بـۆ هـیچ حیزبێک نیـیە. سیاسـەت خـۆی شـتێکی جـوانە، بەڵام لە کوردستاندا پیسکرا!.

بەداخەوە سـەرکردە سیاسـییەکانمان بـوونەتە مافیـا، بـوونەتە کۆمەڵێـک بازرگـانی گەورە گەورە و ئەوەنـدەی سەرگەرمی کەڵەکەکردنی پارەکۆکردنەوەن، نیـو ئەوەنـدە سەرگەرمی خزمەتکردنی کۆمەڵگە نین...کۆمەڵگەی ئـێمە پێوستی بەم جۆرە لە سیاسی نییە، پێویستی بە جۆرێکیتر لە سیاسـییە، سیاسـی کـاریزمی، سیاسـی پیـرۆزی وەک غانـدی و خـومەینی و دەلای لامـا. ئەمـانە دەتـوانن گۆڕانکاریی دروستبکەن. بەداخەوە لای ئێمە ئەم پیـاوانە نین...

گرافیکی ژمارە ٤



## گرافیکی ژمارە ٥



**حیزب لە هەموو دنیادا ئەرکی ئەوەیە کە دەزگاکانی دەوڵەت بەڕێوەبەرێت، ئەرکی ئەوەیە ڕەفاهییەت و خۆشگوزەرانی بۆ کۆمەڵگا دروستبکات و گوێ لە ڕای گشتی بگرێت و گۆڕانکاری بکات...بەڵام بەداخەوە لای ئێمە حیزب نەک هەر ئەمانە ناکات، بەڵکو پێچەوانەکەیان دەکات...**

**هەندێک مەسەلە هەن کە کەسی سیاسی نابێت لێیان نزیکبێتەوە و حەرام و تابۆن. لەوانە خیانەتی نیشتمانی، نیشتمانفرۆشتن، پشتکردنە گەل، گوێنەگرتن لە ڕای گشتی. بەڕاستی مومکین نییە پیاوێکی سیاسی بچێتە مەرتەبەیەکەوە و سواری سەیارەی جام ڕەشببێت و نەزانێ کۆمەڵگەکەی چۆن دەژی!، ئەم جۆرە سیاسییانە دەبێ دادگایی بکرێن. لە کۆمەڵگەی ئێمەدا سیاسییەکان هەمیشە نیشتمان ئەفرۆشن و هەرگیزیش دادگایی ناکرێن.**

**حیبەکانی ئێمە بەچی دەناسرێنەوە؟ بە زۆرترین شوقە، زۆرترین ڤێلا، زۆرترین عەسابە، بە پارێزگاریکردن لە کورسی، لە پرۆژە بازرگانییەکان...بەداخەوە دنیای ئێمە ئاوا ڕەشە!»**

ئاڵا، کچێکی گەنجی کوردە، تەمەنی ٣١ ساڵە، لە سلێمانی، گەڕەکی ئیبراهیم پاشا لەدایکبووە، هەڵگری بڕوانامەی بەکالۆریۆسە، باوکی کاسبە و دایکی ژنی ماڵەوەیە، سێ خوشک و سێ برای هەیە. چیرۆکی لەدەستدانی متمانەی خۆی بە سیاسەت و بیناکردنی وێنەیەکی ڕەشی کۆمەڵگەی کوردی بەم شێوەیە دەگێڕێتەوە:

«من لەسەردەمێکدا منداڵی خۆم تێپەڕاند هەموو ڕوداوی سەختی سیاسی بوو. ئەوە ٣١ ئاب، ئەوە شەڕی ناوخۆ، ئەوە ڕوداوی حیزبە ئیسلامییەکان و حیزبە عەلمانییەکان. لەم وڵاتەی ئێمەدا ئەوە ڕووداوی بەکارهێنانی منداڵ بۆ شەڕ...، ئەوە شۆردنەوەی دەماغی منداڵان لە پێناوی ئامانجی سیاسیدا...ئەمانە هەموو ڕووداوی سیاسی خراپبوون. بەڵام ئەوەی تەئسیری ڕاستەوخۆی لێکردم شتێکی ترە...

من برایەکم لە (ناوی یەکێک لە حیزبەکان دەهێنێت) ئەندامبوو. گرفتێک لەنێوان حیزبی براکەم و حیزبی (ناوی حیزبێکی دیکە دەهێنێت) دا دروستبوو. براکەم لەو حەدەسەیا تیاچوو، شەهید کرا! تۆ لەبەر مەسەلەیەکی سیاسی برایەکت لە دەستبدەی! چەند سەختە شتێکی وا.

تۆ لە موجتەمەعێکدایت کە بڕیارە دیموکراسی هەبێت، کە بڕیارە فەزایەکی ئازاد هەبێت، قەرارە دەربرینی حوڕ هەبێت، قەرارە تەعبیری جیاواز و ئایدیای جیاواز هەبێت، بەڵام لە هەمان ئەم موجتەمەعەیا، برایەکت لەسەر ناکۆکییەکی سیاسی دەکوژرێت و پاشان تەرمەکەشت نایەنەوە و دەبێت واسیتەبکەیت تا تەرمی براکەت دەدەنەوە، ئەمە چ موجتەمەعێکە!».

لە زۆربەی چاوپێکەوتنەکاندا کە گروپی توێژینەوەکەمان ئەنجامیانداوە، ئەم چیرۆکە تراژیدیانە دووبارەدەبنەوە و هەریەکەیان بەجۆرێک باس لە پرۆسێسی چونە دەرەوە لە متمانە بە حیزب و

سیاسەت دەکات. دووبارەبوونەوەی بەردەوامی ئەم ڤاریابڵە بەشێوەیەکی سیستەماتیکی، لە هەردوو توێژینەوەکەدا (کالیتاتیف و کانتیتاتیف)، دەیکات بە بابەتێکی سۆسیۆلۆژی بەهاداری کۆمەڵگەی کوردی، بابەتێک کە دەبێت لە یەک کاتدا زاناکان و سیاسییەکان کاری لەسەر بکەن.

چی بکرێت بۆئەوەی ئەم هاوڵاتیانە لە پرۆسێسی بێ متمانەیی بڕۆنە دەرەوە؟.

لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا، ئێمە سەر لەنوێ ئاماژە بەو چوارچێوەیە دەدەین کە بە درێژایی ئەم توێژینەوەیە کاری لەسەر دەکەین و پێشتر ئاماژەمان بە هێڵە گشتییەکانی دا. ئەم چوارچێوەیە دەتوانێت ببێت بە ڕووبەرێکی گرنگ بۆئەوەی زۆرینەی کۆمەڵگەی مەدەنی لەنێو سیاسەتدا بمێنێتەوە و دنیای سیاسەت وەک دنیایەکی گەندەڵ و ڕیفۆرمنەکراوی هەمیشەیی نەبینێت. گەر مرۆڤی کۆمەڵایەتی پێش هەموو شتێک مرۆڤێکی سیاسی بێت، گەر ئینتیما بۆ حیزبێکیش هەمیشە بژاردەی سەرەکی نەبێت، ئیتر چۆن میکانیزمی وریایی، هەمیشە لەسەرپێبوونی هەمان ئەو مرۆڤە نابێت وەک «ئەولەویەتی» بیناکردنی دیموکراسیەکی تەندروست تەماشابکرێت!.

لە ساڵی ١٩٩١ دا، کە چرکەی ڕاپەڕینە، کوردستانی عێراق کۆتایی بە مێژوویەک لە دەسەڵاتی تۆتالیتاریزمی بەعس و دیکتاتۆریەتی سەدام حوسەین دەهێنێت. لەسەر ئاستی پراکتیک دیموکراسی وەک سیستەمی سیاسی «تەبەنی» دەکرێت و ساڵێک دواتر یەکەم هەڵبژاردن ڕێکدەخرێت، یەکەم پەرلەمانی کوردستان و یەکەم حکومەتی هەرێم دادەمەزرێت. ساڵێک دواتر نیشتمان، بە گۆشت و ئێسقانەوە، پێدەنێتە نێو مێژوویەکی نوێی جەنگی ناوخۆی براکانەوە، جەنگی هەمووان دژ بە

هەمووان. لە سێبەری دیموکراسیدا کۆڵانەکانی شار بوون بە سەنگەری برا تورەکان، شەقامەکان پڕبوون لە خوێنی ڕژاوی ئەو پێشمەرگانەی کە تا دوێنێ خەونیان بە نیشتمانێکی «پڕ لە گوڵ و نەسرین»ەوە دەبینی، هەزاران ژن کە خۆیان ئامادەکردبوو بۆ وتنەوەی سروودی ئەی ڕەقیب، بە سەر تەرمی مێردەکانیاندا ڕووباری فرمێسکیان هەڵدەڕشت، هەزاران منداڵ کە چاوەڕێی کردنەوەی دەرگای قوتابخانەکانیان بوون، کەوتنە سەر شەقامەکان و بوون بە کاڵای کڕین و فرۆشتن! هەموو ئەو خەونانەی کە نەوەی ڕاپەڕین بە دیموکراسییان سپاردبوو، یەک یەک لەبارچوون. ڕاستە بەرپرسیارەکان زۆرن، ڕاستە هۆکارەکان، ئاستەکان فرەن، بەڵام ئەوەش ڕاستە کە ئاستی یەکەم، هۆکاری یەکەم، بەرپرسیاری یەکەم ئامادەنەبوونی کۆمەڵگەی وریایە، کۆمەڵگەیەکی وریا کە چاودێری هەموو لایەک دەکات و لەڕێگای دەستێوەردانە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆکانییەوە، سنور بۆ هەموو لایەک دەدەنێت.

باشترین هەلومەرجێک کە کۆمەڵگەی وریای تیدا دەردەکەوێت هەلومەرجی قەیرانە، هەلومەرجی ململانێی توندە. لە کاتێکدا کە ڕووداوەکان دەگەنە کۆڵانە داخراوەکان، کۆمەڵگەی وریا دێتە دەنگ و هەموو لایەنە ناکۆکەکان لە سنورەکانیان ئاگاداردەکاتەوە. لە وڵاتی ئێمەدا، بە درێژایی نەوەدەکان لە قەیراندابووین، لە ململانێدابووین، بەڵام لەبەر ئەوەی هەلومەرجی کۆمەڵایەتیمان زیاتر لە چەمکی مێگەلەوە نزیکبوو تا لە چەمکی هاوڵاتی، تەنها بۆ جارێکیش نەتوانرا ئەکتەرەکانی ململانێ ناچار بە شتێک لە شتەکان بکرێت.

# (٢)

# هاوڵاتی ڕەخنەگر

لە مێژووی کۆمەڵگەی کوردیدا هەمیشە چەمکی ڕەخنە لکاوە بە مێژووی ئەو ئەکتەرە کۆمەڵایەتییەوە کە پێیدەتورێت «ڕۆشنبیر»، وەک ئەوەی کە تەنها ڕۆشنبیر ئەم مافەی هەبێت و لەدەرەوەی ئەو، کەس نەتوانێت بەکاری بێنێت، یاخود وەک ئەوەی کە تەنها ڕۆشنبیر خاوەنی «توانای» ڕەخنەگرتن و بیرکردنەوەی هەبێت و لەبری هەموومان ئەو بیربکاتەوە و ڕەخنەشبگرێت.

لە سیستەمی دیموکراتیکدا ئەم چوارچێوەیە گۆڕانکاری ڕادیکاڵی بەسەردا دێت. لەم سیستەمەدا نە ڕەخنەگر یەکسانە بە ڕۆشنبیر و نە ڕەخنەگرتنیش یەکسانە بە ڕاگەیاندنی جەنگ [بەشێکی زۆر لە ڕۆشنبیرانی کورد، جیاوازیەکی ڕوون لەنێوان کردەی ڕەخنەگرتن و کردەی جەنگدا ناکەن[٣٢]]. ئەو ڕەخنەگرتنەی کە ئێمە لێرەدا باسیدەکەین بریتیە لە کردەی ناساندنی شتەکان وەک ئەوەی کە هەن، بریتیە لە پەردەلادان

---

[٣٢] خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ بابەتێک کە لە دوازمارەی گۆڤاری ڕەهەندا بەناوی سیاسەتی ڕۆشنبیر و ڕۆشبیری سیاسییەوە بڵاومکردەوە.

لەسەر شتەکان، بریتیە لە ئاشکراکردن، لە ڕونکردنەوە، لە باسکردن. هەروەها ئەو ڕەخنەگرەی کە ئێمە باسیدەکەین بریتیە لە تەواوی هاولاتیانی وریای کۆمەڵگە. هاولاتی لەهەر ئاستێکدابێت، خاوەنی هەر پیشەیەک، هەر پێگەیەک، هەر بروانامەیەک، هەر ئەسڵێکی کۆمەڵایەتی، هەر ئاینێک، هەر کولتورێکی بێت دەتوانێت لەهەموو کات و شوێنێکدا «مومارەسەی» ئەم مافەبکات، بەبێ ئەوەی ڕووبەڕووی هیچ جۆرە سزایەک ببێتەوە.

بێگومان جیاوازییەکی ڕوون لەنێوان کردەی ڕەخنەگرتن و گەڕان بەدوای «فەزیحەت/سکاندال/ئابڕووبرن»دا هەیە. چەند ڕەخنەگرتن بەشداریدەکات لە پرۆژەی چاودێریکردنی دیموکراسی و جێگیرکردنی پایەکانیدا، هێندەش گەڕان بەدوای «فەزیحەت/سکاندال/ئابڕووبردن»دا گورز لە سیستەمی دیموکراسی دەدات و پایەکانی لاوازدەکات. یەکێک لە دەرئەنجامە هەرە خراپەکانی کردەی «فەزیحەت» بریتیە لەوەی کە لەپەنای واقیعی ڕاستەقینەی شتەکاندا واقیعێکی سێبەر دروستدەکات و وامانلێدەکات کە هێندەی سەرگەرمی واقیعی سێبەربین، نیو ئەوەندە سەرگەرمی واقیعی ڕاستەقینەی کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئابووریمان نەبین و بەشێکی گەورەی بەرپرسیاریش دەکەوێتە ئەستۆی ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانەی کە بە «بیپۆل/ بازاڕیی» ناوبانگیان دەرکردووە. ئەم گۆڤار و ڕۆژنامانە هێندەی بەدوای «فەزیحەتێک»دا دەگەڕێن، نیو ئەوەندە بەدوای ڕەخنەیەکی بابەتییانەی بێلایەنانە لە واقیعێکی دیاریکراودا ناگەڕێن. ئەوان هێندەی بەدوای بەرزکردنەوەی ئاستی فرۆشتنی ژمارەکانیاندا دەگەڕێن، نیو ئەوەندە بەدوای واقیعی شتەکاندا ناگەڕێن.

دەکرێت لێرەدا نمونەیەک بە بایەخدانی ڕۆژنامەکان بە ژیانی شەخسی نووسەران بێنینەوە. ئێمە لە کوردستاندا چەند نووسەرێکی «جددی»مان هەیە و ساڵانە چەند کتێبێکی بایەخدار دەخەنە نێو کتێبخانەی کوردییەوە. ئەو تێزانەی ئەم نووسەرانە بەرهەمیدەهێنن دەکرێت ببن بە مەیدانی چەندین بەرنامەی تەلەفزیۆنی، سیمینار، مێزگەرد، بەرنامەی ڕادیۆیی و ڕیپۆرتاژی و تووێژینەوە. بەڵام بەداخەوە نەک هەر نابن بەم شتانە، بەڵکو گۆڤار و ڕۆژنامە بازاڕییەکان دێن و خودی ئەم نووسەرانە دەخەنە نێو هەمان ڕەوتی بەبازاڕیکردنەوە. بۆنمونە، لەبری قسەکردن لەسەر تێزەکانیان، دێن و قسە لەسەر ئەوەدەکەن کە نووسەری کتێبی (....) لە ژنەکەی جیابووەتەوە و ژنێکی تازەی هێناوە!. نووسەری کتێبی (...) کچەکەی بەتەنیا لە ئەوروپا بەجێهێشتووە!. نووسەری کتێبی (...) ژنێکی ئەوروپی هێناوە نەک کورد!. دابەزینی ڕۆژنامە و گۆڤارە پیپۆلەکان بۆ ئەم ئاستە لە دروستکردنی «فەزیحەت» هیچ نییە جگە لە سەرگەرمکردنی کۆمەڵگە بە واقیعی سێبەرەوە نەبێت. لەبری لێکدانەوەی بابەتییانە و زانستییانەی مەودای نێوان موچەی سەری سەرەوەی کۆمەڵگەی کوردی و خواری خوارەوەی هەمان کۆمەڵگە، لەبری خستنە ڕووی سەداتان داتا لەم بوارەدا، ئەوان دێن و باسی ئەوەمان بۆدەکەن کە چۆن نووسەری ڕۆمانی (...) وازی لە ژنەکەی هێناوە!. لە هەلومەرجێکی ئاوادایە کە ئێمە پێمانوایە ڕەخنەی بیناکراو لەسەر «فەزیحەت» هیچ سودێک بە دیموکراسی و ژیانی تەندروستی کۆمەڵگەی مەدەنی ناگەیەنێت.

هاوڵاتی ڕەخنەگری وریا ئامانجێکی خاوێنی هەیە و حیقد و دوژمنایەتی سەرچاوەی جوڵانەوەکانی نین، بەڵام ئەکتەری ئیشکەر لەسەر

«فەزیحەت» لەنێو ڕەوتی بریندارکردنی کەسایەتییەکاندایە و ئامانجی سەرکی بریتیە لە ئابڕوبردن. هاوڵاتی ڕەخنەگری وریا لەپەنای شەرعیەتی «شەفافیەت»دا بەوردی چاودێریی جومگە بە جومگەی دەسەڵات دەکات، بەڵام ئەکتەری ئیشکەر لەسەر «فەزیحەت» بەناوی هەمان شەرعیتەوە ڕێگا بەخۆی دەدات کە دەستبەرێت بۆ ڕووبەرە هەرە تایبەتەکانی ژیانی شەخسی کەسێک. هاوڵاتی ڕەخنەگری وریا دەیەوێت واقیعێکی بابەتییانە بەتەندروستی بمێنێتەوە و لەچرکەی لادانیدا ڕێگای لێبگرێت، بەڵام ئەکتەری ئیشکەر لەسەر «فەزیحەت» دەیەوێت بینینی مرۆڤەکان لەسەر کەسێک یان شتێک دەستکاری بکات، با ئەو دەستکاریکردنەش هیچ بناغەیەکی کۆنکرێتی نەبێت؛ واتە با دروستکراویش بێت!

ئەوەی من و پیەر ڕۆزانڤالۆن لەیەک جیادەکاتەوە ڕوانینمانە بۆ ڕۆڵی «فەزیحەت». لەکاتێکدا ئەو هەستی ئەوەمان لادروستدەکات کە ئەم لۆژیکەش دەتوانێت لە چوارچێوەی چاودێریکردنی دیموکراسیدا جێگای ببێتەوە، ئێمە پێمانوایە کە نەک هەر جێگای نابێتەوە، بەڵکو زیانیشی پێدەگەیەنێت. لۆژیکی «فەزیحەت» کارکردنێکی توندە لەسەر هەڵوەشانەوەی نۆرم و ڕێکخستن و پەیوەندییە «کۆلێکتیڤەکان»، پەنابردنە بۆ ونبوون لە کۆڵانەکانی مۆدێرنیتێدا، دروستکردنی مرۆڤی نەخۆشە لە کۆمەڵگەدا، بەڵام لۆژیکی هاوڵاتی وریای ڕەخنەگر ئیشکردنە لەنێو فراوانکردنی نۆرم و ڕێکخستن و پەیوەندییە کۆلێکتیڤەکاندا، گەڕانە بۆ دەرچوون لە کۆڵانە داخراوەکانی مۆدێرنیتێدا، خەونبینینە بە دروستکردنی هاوڵاتی تەندروستی کۆمەڵایەتییەوە.

ڕەخنەگرتنی وریا چوارچێوە بۆ پارێزگاریکردن و بەردەوامبوونی یادەوەری کۆلێکتیڤی کۆمەڵگە دادەنێت و لەڕێگای چاودێریکردنی ورد و

ڕەخنەی وشیارانەوە نوخبەی سیاسی ڕادەکێشێتە بەردەم دادگاکانی یادەوەری کۆلێکتیڤی[٣٣] کۆمەڵگەوە. لێرەوە میکانیزمی ڕەخنەگرتنی وریا

---

[٣٣] مۆریس ئەلڤاکس، گەورەسۆسیۆلۆگی سۆسیۆلۆژیای یادەوەری، لەهەردوو کتێبی (چوارچێوە کۆمەڵایەتییەکانی یادەوەری) و (یادەوەری کۆلێکتیڤ)دا و، پاش پیشکنینێکی وردی هەموو ئەو تیۆرانەی کەلەم مەیدانەدا بەرهەمهێنراون، دەگاتەئەو دەرئەنجامەی کە یادەوەری وەک مەخزەنی کۆکردنەوە و خەزنکردن و پاراستنی ڕووداوەکان بوونی نیە. یادەوەری ئەو ژورە شووشەییە نیە کە یادگاریەکانی تیادا دابنرێت و وەک یەکەمین جاری دروستبوونیان لەو ژورە شووشەییەدا نمایش بکرێن. بەپێچەوانەوە، یادەوەری بریتیە لە دەرئەنجامی بیناکردنەوەی پەیوەندی مرۆڤ بە رابردووەوە. واتە یادەوەری بریتی نیە لە رابردوو، لە روداوەکان، لە یادەوەرییەکان، بەڵکو بریتیە لە پەیوەندی مرۆڤ پێیانەوە. ئەم پەیوەندییەش لەنێو هەر "ئێرە و ئێستا"یەکی مرۆڤەکاندا بەردەوام بینادەکرێتەوە. ئەم بیناکردنەوەیەش بێگومان چوارچێوەکانی لەنێو "گەردوونی ژیاو"ی تاکەکانی گروپێکی بەشەریدا دیاری دەکرێت. تا ئێرە لەگەڵ مۆریس ئەلڤاکسدا هاو دەنگم، بەڵام لەو جێگایەدا کە ئەو دەوەستێت، گەر ئێمەش بووەستین، پێموایە وەک پێویست ناتوانین لەپرسیاری (چۆن مرۆڤەکان رەفتارو گوتار بەرهەمدێنن) تێبگەین. بۆیە بۆ ئەوەی تیۆرەکەی ئەلڤاکس کامڵبکەین، دەتوانین بڵێین، بیناکردنەوەی پەیوەندی بەڕابردووەوە بەتەنها لەنێو (گەردوونی ژیاو)دا دیاری ناکرێت، بەڵکو بەرژەوەندییەکانی مرۆڤ لە (لەئێستا و ئێرە) کانیشیدا بەشدارییەکی زیندوو لەپرۆسەی بیناکردندا دەکەن. راستە مرۆڤ مەخلوقی مێژووە کۆمەڵایەتییەکەیەتی، بەڵام ئەوەش راستە کە هەمان ئەو مرۆڤە کائینێکی پراگماتیستە و بەپێی بەرژەوەندیەکانی نێو ئێستا و ئێرەی، میتۆدی نوێی پەیوەندی کردن بە رابردووەوە دروستدەکات. لێرەوە ئێمە هەردوو گەورە ترادیسیۆنی سۆسیۆلۆژیا بەیەکەوەگرێدەدەین. مەبەستمان لەسۆسیۆلۆژیای راڤەکردن (ئوگست کۆنت، ئێمیل دورکهایم، موریس ئەلڤاکس، پیەر بۆردیۆ، بیرنار لایر) و سۆسیۆلۆژیای تێگەشتنە ( ماکس ڤێبەر، ئەلەفرێد شووتز، بێرگەر و لوکمان، ئیڤرین گۆفمان،

خۆی جیادەکاتەوە لە زمانی جنێودان کە کار لەسەر هەمیشە گەرمکردنی کولتوور دەکات. گەر جنێو بریتیبێت لە ووروژاندنی هەستی کەسێک، گروپێک یان ناوەندێک بە سەلبی یان ئیجابی، ڕەخنەگرتنی وریا بریتیە لە خواستی هەمیشە ئامادەی ریفۆرمکردنی هەموو ئەو شتانەی کە پێویستیان بە ریفۆرم هەیە. بۆنمونە جیاوازییەکی زۆر لەنێوان جنێودان بە گۆڕی ژەنەراڵ بەرزانی و ڕەخنەگرتن لە سیستەمی دابەشکردنی داهاتی نیشتمانیدا هەیە. یەکەمیان کار لەسەر دروستکردنی حیقد و دووهەمیشیان کار لەسەر ریفۆرمکردنی سیستەمی سیاسی دەکات.

بەدیوێکی دیکەدا، وەک بەشێکی زۆر لە کۆمەڵگە جیهانییەکان، کۆمەڵگەی کوردیش بە قۆناغێکدا تێدەپەڕێت کە دەکرێت ناویبنێن پۆست ئایدۆلۆژیا. هەر لە ئایدۆلۆژیای مارکسیستەوە تا دەگاتە ئایدۆلۆژیای ئیسلامیست لە کاڵبوونەوەیەکی خێرای بەرچاودان و تەنانەت خودی هەڵگرە مێژوویەکانی ئەم ئایدۆلۆژیایانەش لە لێکدانەوەی ڕادیکاڵی جیاوازی سەرمایە ڕەمزیەکانیاندان، بەشێوەیەک کە لەگەڵ دنیای نوێدا بگونجێت. وەک چۆن چەپەکانی کوردستان چیدی باس لە دروستکردنی دیکتاتۆریەتی پلۆریتاریا ناکەن، ئاواش ئیسلامیستەکانی کوردستان گەشتونەتە ئەو قەناعەتەی کە دەوڵەتی ئیسلامی داهێنانێکی سەیدقوتابییانەی نێو زیندانەکانە و تەنها لە خەیاڵداندا دەکرێت بوونی هەبێت. کۆی ئەم ئەکتەرانە هاوڕان لەسەر ئەوەی کە کۆمەڵگەی کوردی

---

گارفینکەل، لوک بۆلتانسکی). سەرچاوە : عادل باخەوان، تیرۆریسم وەک بیناکردنی کۆمەڵایەتی، دەزگای سەردەم، ٢٠٠٧.

لە ئێستا و ئێرەدا پێویستی نە بە دیکتاتۆریەتی پلۆریتاریە نە بە دەوڵەتی ئیسلامی، بەڵکو بە دەوڵەتێکی مەدەنی خزمەتگوزار. بەڕێز سەلاحەدین بەهادین، کە دامەزرێنەری یەکگرتووی ئیسلامییە و نزیکەی نیو سەدەی تەمەنی لەگەڵ پرۆژەی ئیسلامی سیاسیدا بەسەر بردووە، بەم شێوەیە باس لە دەوڵەتی مەدەنی و بەرەی ئیسلامی دەکات:

«من لەهەلومەرجی ئێستادا لەگەڵ ئەوەدا نیم (بەرە)یەکی هاوبەشی ئیسلامی دروستبکرێت و کوردستان لەسەر بنەمای ئیسلامی و عەلمانی جیابکرێتەوە، ئەوە کارێکی هەڵەیە و ئێستا ئەو شێوازە کارکردنە بەقازانجی لایەنە ئیسلامییەکان نییە، بگرە بەزیانیش دەشکێتەوە بەسەریاندا، چونکە گۆڕینی ڕیزبەندی بەرەی ئۆپۆزسیۆن و بەرەی دەسەڵات بەئیسلامی و عەلمانی لەم هەلومەرجەدا زۆر بەقازانجی دەسەڵاتە، واتە ڕەنگە هەندێک لایەن بۆ ئەوەی ئیسلامییەکان لەلیستێکی داخراوی ئیسلامیدا قەتیسبکەن، پێشیان خۆشبێت کە ئیسلامییەکان ئەو دەستپێشخەرییە بکەن و بەرەی ئیسلامی و عەلمانی جیابکەنەوە، ئێستا لەکوردستان کێشەکان لەسەر خزمەتگوزاری و چاکسازییە نەک ئایدۆلۆژیا، ئەمەش بەو مانایە نییە کە هاوکاری هێزە ئیسلامییەکان و کاری هاوبەشیان ڕەتبکەنەوە، بەڵکو بەجددی لەگەڵ کاری

**هاوبەشی ئیسلامییەکانم بەمەرجی ئەوەی لەسەر حیسابی هاوکێشەی سیاسی ئۆپۆزسیۆن بوون نەبێت[٣٤]».**

پشتکردنە دەوڵەتی ئیسلامی و تێکۆشان لەپێناوی «دەوڵەتی خۆشگوزەرانی»دا، گەر بەتەنها لە گوتاری ئەکتەرێکی سیاسی وەک بەڕێز سەلاحەدین بەهادین دا خۆی دەربخستایە، لەسەر ئاستی زانستە کۆمەڵایەتییەکان بەهایەکی ئەوتۆی نەبوو، بەڵام دووبارەبوونەوەی لای بەشێکی زۆر لە ئیسلامیستە میسریەکان، تونسیەکان، مەغریبیەکان، جەزائیریەکان، تورکەکان، ئەندەنوسیەکان، ...، وایلێدەکات کە بیکات بە دیاردەیەکی جیهانی کۆمەڵایەتی/سیاسی و شیاوی ئەوەبێت کە بیناکردنی تیۆری لەسەر بکرێت. واتە قسەکردن لەسەر کۆمەڵگەی پۆست ئایدۆلۆژیا لەسەر داتای کۆنکرێتیە نەک لە لەسەر بۆشایی.

لەهەلومەرجێکی ئاوادا بیناکردنەوەی ستراکتۆری دەروونی و کۆمەڵایەتی مرۆڤی کوردستانی وەک هاوڵاتی وشیاری ڕەخنەگر؛ کە لەهەر چرکەیەکدا دەکرێت مومارەسەی خواست، خەون، بەرژەوەندی و ستراتیژیەکانی خۆی بکات، دەبێت بە فەرمانی سەرەتای سەرەتاکان. لە کۆمەڵگەی پۆست ئایدۆلۆژیادا، هێندەی گڵۆپەکان لەسەر ڕووبەرەکانی هاوڵاتی وشیار وەک کەسی تاک دادەگیرسێن نیو هێندە لەسەر چوارچێوە دەستەجەمعیەکان داناگیرسێن. ڕاستە کۆمەڵگەی کوردستانی تا ئێستاش لەنێو ماکرۆ ستراکتۆرێکی زەبەلاحدایە، بەڵام ئەوەش ڕاستە کە سەرەتاکانی چونە دەرەوە لەم ماکرۆ ستراکتۆرە زەبەلاحە دەستپێکردووە. ڕاستە چونەدەرەوە لەم ماکرۆ ستراکتۆرە زەبەلاحە کارێکی ئاسان نییە و

---

34 http://www.lvinpress.com/newdesign/Drejeb.aspx?jimare=1167

مێژوویەکی درێژی دەوێت، بەڵام ئەوەش ڕاستە کە هەلومەرجی کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئابووری، لەسەر ئاستی بابەتی، جگە لەم چونەدەرەوەیە گریمانەیەکی دیکەی بەهێزی لەبەردەستدا نییە.

لە ساتەوەختی گەڕانەوە بۆ داتاکانی توێژینەوە مەیدانییەکەمان، تێبینی ئارەزوویەکی توندی چونەدەرەوە لەم ماکرۆ ستراکتۆرانە دەکەین؛ چونەدەرەوەیەک کە دەستەویەخە خۆی لەگەڵ چەندین بەرەنگاریدا دەبینێتەوە: بەرەنگاری لەلایەن دەزگاکانی وەک خێزان، حیزب، مزگەوت، خێڵ، قوتابخانە، زانکۆ،...، بەبێ ئەوەی بتوانێت دەستکاری ئەو ئارەزووە توندە بۆ چونەدەرەوە بکات. ئەو «موئەشیرە/ئەندیکاتۆر»ی کە دەمانباتەوە سەر پرۆسێسی چونەدەرەوە لە ماکرۆ ستراکتۆرەکان بریتیە لە: بێئومێدی/ڕەشبینی. ڕەشبینی لەبەرامبەر ڕابردوویەکدا کە خودی ئەم ماکرۆ ستراکتۆرانە دروستیانکردووە، ڕەشبینیش بەرامبەر بە داهاتویەک گەربێت و لەژێر هەژمونی هەمان ئەم ماکرۆ ستراکتۆرانەدا بێت. دیاردەی ڕەشبینی بەتەنها ڕەهەندێکی نێگەتیڤی نییە، بەڵکو ڕەهەندێکی پۆزەتیڤیشی هەیە کە بریتیە لە دەرخستنی تواناکانی هاوڵاتیانی کۆمەڵگەیەکی ناڕەزا، ڕەخنەگر، دژە عەقڵیەتی مێگەل. لە وەڵامدانەوەی پرسیاری: ئایا گەشبینیت بەرامبەر ئاییندەی گۆڕانکارییە سیاسییەکان لە کۆمەڵگەی کوردیدا؟ چەند کاتیگۆرییەکی کۆمەڵایەتی دێنە دەنگ.

(٤٨,٥٪) ژنان بەهیچ شێوەیەک گەشبین نین بە ئاییندەی گۆڕانکارییەکان و تەنها (٨,٢٪) زۆر گەشبینن لەبەرامبەر داهاتودا. (٤٦,٧٪) پیاوان چاوەڕوانی هیچ ئاسۆیەکی گەش لە ئاییندەی گۆڕانکارییە سیاسییەکان ناکەن و تەنها (١١,٢٪) چاوەڕوانی شتی جوان لە داهاتوو دەکەن. ڕێژەی ڕەشبینی ئەو کەسانەی کە تەمەنیان لە خوار بیست

ساڵەوەیە، کە نەوەی داهاتووی کۆمەڵگەی کوردی پێکدەهێنن، زیاتر لەو کەسانەی کە تەمەنیان لەسەروی ٣٠ ساڵەوەیە! (٤٦,٨٪) کەمتر لە بیست ساڵان بەهیچ شێوەیەک گەشبین نین بەرامبەر بە داهاتووی گۆڕانکارییە سیاسییەکان لە کوردستاندا و بەتەنها (١٠,٦٪) گەشبینن. ئەوانەی تەمەنیان لەسەوری ٣٠ ساڵەوەیە ڕێژەی ڕەشبینییان دەگاتە (٣٩,٦٪) و ڕێژەی گەشبینیشیان دەگاتە (١٩,٨٪).

واتە ئەو نەوەیەی کە لە نەوەدەکانی ڕابردوودا لەدایکبووە؛ نەوەی جەنگی ناوخۆی شارەکان، نەوەی گەمارۆی ئابووری، نەوەی لەتکردنی کوردستان، نەوەی قووڵبوونەوەی نایەکسانی کۆمەڵایەتی، نەوەی کۆتایی ڕژێمەکەی سەدام حوسەین، نەوەی هەڵبژاردنە یەک لەدوای یەکەکانی کوردستان، نەوەی نەوت و ئۆتۆمۆبیلی مۆدێل بەرز، نەوەی ڕۆژنامەی ئازاد، نەوەی فەیسبوک ڕەشبینترە لە ئەو نەوەیەی کە لە سەرەتای هەشتاکاندا لەدایکبووە؛ واتە نەوەی ئەنفال، نەوەی کیمیایی هەڵەبجە، نەوەی جەنگی عێراق/ئێران، نەوەی شۆڕشی نوێ، نەوەی ئاوارەی ئۆردوگاکان، نەوەی نێو زیندانەکانی ئەشکەنجەدان!.

گەر نەوەی پێش ڕاپەڕین خەونی بە ئازادی کوردستانەوە بینیبێت و ژیانی خۆی بۆ ڕزگاربوون لە داگیرکردنی نیشتمانەکەی تەرخانکردبێت، ئەوە نەوەی نوێی پاش ڕاپەڕین خەون بە ئازادییەکانی خۆیەوە دەبینێت و ژیانی خۆی بۆ چوونەدەرەوە لە هەژموونی ماکرۆ ستراکتۆرەکان تەرخاندەکات.

کێن ئەوانەی دەبن بە قوربانیی ئەم چونە دەرەوەیە؟ چەند نەوە دەبن بە قوربانی؟ کێن ئەوانەی لەسەر ئاستی ڕەمزی، خوێنیان دەڕژێتە سەر شەقامەکان، لە زیندانەکاندا گیانیان دەسپێرن، سەدان کەرەسەی

ئەشکەنجەدانیان لەسەر تاقیدەکرێتەوە؟ کێن ئەوانەی ئەم پەڕینەوەیە دەیانکات بە «قوربانی» مانا هاوبەشەکان، یادەوەری کۆلێکتێڤ، جەستەی کۆمەڵایەتی گونجاوی گونجاوکراوی گونجاوکار؟

لەڕاستیدا چەندین جار ئەم پرسیارانە لە زمانی ڕۆشنبیران، ڕۆژنامەنوسان، لاوانی نەوەی نوێ بە کچ و کوڕەوە ئاڕاستەمکراوە، بەتایبەتی لە کاتی گەڕانەوە بەردەوامەکانمدا بۆ کوردستان. کەمن ئەو کەسانەی کە لە پانتاییە جیاوازەکاندا دەیانبینم و بە زمانی خۆیان ئەم پەرسیارانەم لێنەکەن. من لە قوڵایی ئەو پرسیارانەدا هەست بە جۆرێک لە ڕەشبینی، بێ ئومێدی خاوەنەکانیان دەکەم؛ بەڵام بەداخەوە من نە لەبەردەم ئەواندا و نە لەنێو ئەم دەقانەشدا ناتوانم وەڵامێکی یەکلاییکەرەوەیان بدەمەوە. تەنها دەتوانم ئاماژە بەوەبدەم کە ژمارەی قوربانییەکان لە ئاستێکی بەرزدا دەبن و چۆنییەتی بوون بە قوربانیش چەندین چوارچێوەی تراژیدی لە خۆی دەگرێت و تەنها داهاتووش دەتوانێت شتەکانمان وەک خۆیان بۆ ڕونبکاتەوە.

# (٣)
# هاوڵاتی نمرەبەخش

پرۆسێسی چاودێریکردنی سیستەمێکی سیاسی بیناکراو لەسەر دیموکراسی ناتوانێت ئامانجەکانی خۆی بپێکێت بەبێ ئامادەبوونی بەهێزی هاوڵاتیەکی «وریا» و «ڕەخنەگر». بەڵام بەتەنها ئەم دوو ڕەهەندەش بەسنین بۆئەوەی دیموکراسییەک بتوانێت بەشێوەیەکی تەندروستانە ژیانی گشتی کۆمەڵگەیەک ڕێکبخات و درێژە بە تەمەنی خۆیبدات. بەبێ ڕەهەندی سێیەمی هاوڵاتی (کە ئێمە لێرەدا ناویدەنێین هاوڵاتی نمرەبەخش)، کۆمەڵگەی دیموکراتیک دەبێت بە کۆمەڵگەی شەڕە جنێو، دەمەقاڵێ، هاوارکردن، دەنگەدەنگ، فەرتەنەی سەر تەلەفزیۆنەکان، ئاژاوەی ناو ڕادیۆکان، ڕیپۆرتاژی نێو ڕۆژنامەکان، بەبێ ئەوەی هەموو ئەمانە بتوانن دەستکاری پێگەکان بکەن، گۆڕانکاری ستراکتۆراڵ دروستبکەن و ئاراستەی شتەکان بگۆڕن.

سیستەمی دیموکراتی زیندوو هەمیشە لەلایەن کۆمەڵگەیەکەوە چاودێریدەکرێت کە هەموو جومگەکانی بەردەوامدەخاتە نێو کردەی «هەڵسەنگاندن» و «نمرەبەخشین»ەوە. هەڵسەنگاندن بریتیە لە پشکنینی بیناکراو لەسەر دۆکۆمێنت، تەکنیک و نمرەبەخشین. هەر

نمرەیەک کە بە ئەکتەرێک، دەزگایەک، ئۆرگانێک، خزمەتگوزارییەک، گروپێک، حیزبێک دەبەخشرێت دەبێت چەندین بەڵگەی بەهێز، بابەتی و وردی لە پشتەوە بێت. بێهودەنییە کە لە دیموکراسییە گەورەکانی وەک ئەورووپا و ئەمەریکای باکوردا هەزاران دەزگای تایبەت بە هەڵسەنگاندن و نمرەبەخشین دامەزراون و ڕۆژانە چاودێری وڵاتەکانیان دەکەن و لەڕێگای نمرەکانیانەوە ئاڕاستەی ڕووداوەکان دەگۆڕن.

کردەی هەڵسەنگاندن و نمرەبەخشین لە دوو ئاستدا جێبەجێدەکرێت. لە ئاستی دەزگا و لە ئاستی هاوڵاتی ئاساییشدا. لە هەر یەکێک لەم دوو ئاستەدا (دەزگا/هاوڵاتی) چەندین چوارچێوەی یاسایی و میتۆدۆلۆژی هەن و دەبێت کاریان لەسەر بکرێت و هەر کردەیەک بکەوێتە دەرەوەی ئەم چوارچێوانەوە نە بایەخی یاساییدەبێت نە بایەخی میتۆدۆلۆژیش. بێگومان ئەوەی ئێمە لێرەدا کاری لەسەردەکەین چۆنییەتی دروستکردنی هاوڵاتی ئاسایی وەک هەڵسەنگێنەری پیشەیی نییە؛ چونکە هەرگیز ناتوانین کۆی کۆمەڵگەیەک لەسەر بنەما یاسایی و میتۆدۆلۆژیەکان بکەین بە هەڵسەنگێنەر و تەنانەت لە دیموکراسییە گەورەکانیشدا شتێکی وا بەشێکە لە موستەحیل. ئەوەی ئێمە کاری لەسەردەکەین، ئامادەیی هاوڵاتیەکی وریا و ڕەخنەگر و نمرەبەخشە لە ئاستە گشتیەکاندا.

بۆ دووبارەنەکردنەوەی کۆمەڵگەی ئاژاوە، کۆمەڵگەی هاش و هوش، کۆمەڵگەی جەنجاڵی دروست وەک ئەوەی کە ئێستا لە جیهانی عەرەبیدا ڕوودەدات (تا دەتوانی هاواربکە، جنێو بە بەرامبەرەکەت بدە، لەسەر تەلەفزیۆن هەڕەشەی لێبکە، تەنانەت دەمانچەی لێدەربێنە، جنێو بە گۆڕی باوکی بدە، ....)، لە دیموکراسی کوردیدا دەبێت هاوڵاتیان هەلومەرجی بابەتییانەی نمرەبەخشین ئامادەبکەن، بەومانایەی کە

چەند مەودای نێوان هەمان پڕۆژە و هەمان واقیع درێژببێتەوە هێندەش نمرەی نزمی پێدەبەخشرێت و گەر سیستەمی دیموکراتیکی کوردی پێگەشتوشبێت، ئەم نمرە نزمە دەتوانێت نوخبەی دەسەڵات ناچار بە بڕیاری سەخت بکات، بە هەڵوەشانەوەی حکومەتیشەوە.

ڕووبەری دووهەمی هەڵسەنگاندن و نمرەبەخشین بریتیە لە چاودێریکردنی پەیوەندییەکانی نێوان ئەو «ئامانج»انەی کە نوخبەی دەسەڵات دەستنیشانیاندەکات. گەر ئەم ئامانجانە لەنێو یەکەیەکی هاوئاهەنگدانەبن دواتر نەک هەر بەدینایەن بەڵکو قەیرانی گەورەش دروستدەکەن. بۆنمونە: کاتێک نوخبەی دەسەڵات یەکێک لە ئامانجە سەرەکییەکانی دەکات بە بەرتەسککردنەوەی مەودای نێوان چینی خوارەوەی کۆمەڵگە و چینی سەرەوەی کۆمەڵگە، بەڵام لەهەمانکاتدا ئامانجێکی دیکەی بریتیە لە دروستکردنی بازاڕێکی ئازاد کە تیایدا داهاتی ساڵانەی کەسێکی سەرەوەی کۆمەڵگە دەتوانێت بەڕادەیەک بەرزببێتەوە (پێنج سەد هەزار دۆلار) کە یەکسانبێت بە داهاتی چل و یەک ساڵی کەسێکی دیکە خوارەوەی کۆمەڵگە (دوانزە هەزار دۆلار لە ساڵێکدا). واتە داهاتی تەنها یەک ساڵی کوردێکی سەرەوەی کۆمەڵگە یەکسانە بە داهاتی چل و یەک ساڵی کوردێکی دیکەی خوارەوەی کۆمەڵگە! لە بازارە ئازادەکاندا گەر تەمەنی هاوڵاتیەک هەشتا ساڵ بێت، یەک ساڵ کارکردنی کوردێکی سەرەوەی کۆمەڵگە یەکساندەبێت بە نیوەی تەمەنی کوردێکی دیکە! لە سیستەمێکی دیموکراتیکدا، کۆمەڵگەی وشیار و ڕەخنەگر بەوردی چاودێری ئەو لێکدژییە لەنێوان ئامانجەکانی نوخبەی دەسەڵاتدا دەکات و پاشان هەڵیدەسەنگێنێت و نزمترین نمرەی پێدەبەخشێت.

ڕووبەری سێیەمی هەڵسەنگادن و نمرەبەخشین بریتیە لە ئامادەکردنی ئامانجەکان بەپێی ئەو کەرەسە و تواناییانەی کە لەبەردەستدان. کاتێک کە نوخبەی سیاسی کوردی گەڕانەوەی کەرکوک بۆسەر کوردستان دەکات بە یەکێک لە ئامانجە سەرەکییەکانی ماوەی ئەو چوار ساڵەی کە دەنگی پێدەدرێت، کۆمەڵگەی مەدەنی وریا و ڕەخنەگر مافی ئەوەی هەیە کە بەوردی ئەم ئامانجە هەڵبسەنگێنێت و بزانێت تا چەند، لەسەر ئاستی واقیع، ئەم نوخبەیە خاوەنی هەموو ئەو کەرەسانەیە کە ڕێگای پێدەدەن هەر بەڕاستی کەرکوک بگەڕێتەوە سەر کوردستان. واتە بەراوردکردنی ئامانجەکان بە کەرەسەکان، خوێندنەوەی ئامانجەکان لەڕێگای کەرەسەکانەوە، بڕیاردان لەسەر ئامانجەکان لە تاقیکردنەوەی کەرەسەکانەوە کارێکی ئاسایی و هەمیشەیی کۆمەڵگەی مەدەنییە. بەبێ پشکنینی کەرەسەکان، بەبێ وردکردنەوەی تواناکان، هەر حیزبێک دەتوانێت سەدان ئامانجی جوان بخاتە بەرنامەکانییەوە و لە دنیای تیۆریدا کوردستان بکات بە بەهەشت. ئەو کۆمەڵگەیەی کەرەسەکان و تواناکان هەڵناسەنگێنێت، دەبێت بە بابەتی یارییپێکردن و دەستاودەستپێکردن لەلایەن نوخبەی دەسەڵاتەوە.

بەشێوەیەکی گشتی لەبەرامبەر نوخبەی سیاسی کوردیدا، هاوڵاتیانی کۆمەڵگەی مەدەنی دەبێت هەمیشە خاوەنی ئەم شەش پرسیارەبن:

- چی: لەسەر چ پرۆژەیەک قسەدەکەین؟.
- کێ: کێن ئەو ئەکتەرانەی کە ئەو پرۆژەیە جێبەجێ دەکەن؟.
- چۆن: چۆن پرۆژەکە جێبەجێدەکرێت؟.
- کوێ: لە کوێدا پرۆژەکە جێبەجێدەکرێت؟.
- کەی: کەی پرۆژەکە جێبەجێ دەکرێت؟.

- لەبەرچی: لەبەرچی پرۆژەکە جێبەجێدەکرێت؟.

هەر کۆمەڵگەیەک فێری ئەوەببێت کە بەردەوام و لەسەر هەموو جومگەکان نوخبەی دەسەڵات ڕابکێشێتە نێو هۆڵەکانی تاقیکردنەوەی ئەم شەش پرسیارەوە، دەتوانین بڵێین چانسی پاریزگاریکردن لە دیموکراسییەکی تەندروست بەشێوەیەکی گرنگ بەرزدەکاتەوە. بە ئاڕاستەی پێچەوانەشدا، لە ئامادەنەبوونی ئەم پراکتیکەدا، گەڕانەوە بۆ دیکاتۆریەت، تۆتالیتاریزم، ستەمکاری گریمانەیەکی هەمیشە ئامادەدەبێت!.

# بەشی سێیەم
## کێن ئەوانەی چاودێریی دیموکراسی دەکەن؟

ئەکتەری یەکەم: بزوتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان.

ئەکتەری دووەم: ئینتەرنێت و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان.

ئەکتەری سێیەم: گروپی تایبەتمەندە جیاوازەکان.

لە لاپەڕەکانی سەرەوەدا تێگەشتین لەوەی کە دیموکراسییەکی تەندروست بەبێ هەر سێ میکانیزمی «وریابوون/ ڕەخنەگرتن/ نمرەبەخشین» ناتوانێت درێژە بەتەمەنی خۆی بدات و لە ئامادەنەبوونی ئەم سێ میکانیزمەدا دەکرێت بە ئاسانی سەری لە تۆتالیتاریزم یان دیکتاتۆریەتەوە دەربچێت. ئێستا کاتی ئەوەهاتووە کە تێبگەین لەوەی کێن ئەوانەی چاودێریی دیموکراسی دەکەن؟ کێن ئەوانەی کە پەیامی درێژەدان بە مێژووی دیموکراسی لە ئەستۆی خۆیان دەگرن؟.

چەند دیموکراسی لە کۆمەڵگەیەکی ئاڵۆزدا و وەک پرۆسێسێکی ئاڵۆز خۆی بەدیبێنێت، هێندەش ڕەوتی چاودێریکردنی دیموکراسی ئاڵۆزدەبێت. چەند دیموکراسی ڕووبەرەکانی خۆدەرخستنی لە «موفرەد» وە بکات بە «جەمع»، هێندەش ڕەوتی چاودێریکردنی دابەشدەبێت. دیموکراسی هێڵێکی درێژبووەوە بەنێو مێژوودا نییە، بەڵکو ئەو جیهانە ئاڵۆزیە کە تیایدا چەندین هێڵی یەکتر بڕ، چەندین لێکدژی، چەندین پارادۆکس بەیەکدەگەن. لە هەلومەرجێکی ئاوادا، ئەکتەرەکانی چاودێریکردنی دیموکراسی تەنها ئەگەرێکیان لەبەردەستدایە کە بریتیە لە دەرکەوتن لە ئاستی «فرەیی»دا. چەند پراکتیککردنی دیموکراسی «فرە» بێت هێندەش ئەکتەرەکانی چاودێریکردنی فرەدەبن.

لە سەدەکانی ڕابردوودا دوو ئەکتەری بەهێز چاودێریی دیموکراسییان کردووە و هەنگاو بە هەنگاو هاوڕێیەتیان کردووە. ئەکتەری یەکەم بریتیبووە لە مینبەر. مینبەری شاعیران، پەرلەمانتارەکان، مەلا و قەشەکان، سیاسییەکان. مینبەر واتە شوێنی وتاردان، ئەو پانتاییەی کە ئەکتەرێک تیایدا دەردەکەوێت و ڕووبەڕووی جەماوەرێک گوزارشت لە بۆچوونەکانی دەکات. ئەم چوارچێوەیە لە هاوڕێیەتی دیموکراسی هەر لە سەردەمی

ئەکتەری دووهەمیش بریتیە لە قەڵەم. مێژووی قەڵەم و مێژووی دیموکراسی دیموکراسی ئیغریقیەکانەوە ئامادەیی هەبووە و تا ئێستاش بەردەوامە. پێکەوە لکاون. قەڵەم هەرگیز نەیهێشتووە دیمورکراسی بە ئاسودەیی بخەوێت، هەمیشە تێیگەیاندووە لەوەی کە ئەو لێرەیە بۆ چاودێریکردنی و سەدە لە دوای سەدە گەشەی بەم ڕۆڵە جەوهەریەی خۆی داوە.

بەڵام لە سەرەتاکانی سەدەی بیست و یەکەوە، بەتایبەتی پاش سەر هەڵدانی ئینتەرنێت بە ڕێژەیەکی فراوان، پاش دەرکەوتنی بەهێزی بزوتنەوە تازە کۆمەڵایەتییەکان، پاش دروستبوونی ئاژانسەکانی نمرەبەخشین، ئیتر ئەو دنیایە کۆتاییپێدەێت کە بەتەنها میمبەر و قەڵەم چاودێریی دیموکراسییان دەکرد. ئیتر ئەو دنیایە کۆتاییپێدێت کە بەتەنها ڕیپۆرتاژەکانی نیویۆرک تایمز یان لۆمۆند کۆتایی بەژیانی دەسەڵاتدارێک دەهێنا و ژیانیان بە دەسەڵاتدارێکی دیکە دەبەخشی.

کۆتایی ئەم دنیا کلاسیکیە و سەرهەڵدانی دنیای نوێ، لە پاڵ هاوڵاتی وریا و ڕەخنەگر و نمرەبەخشدا (کە لە بەشەکانی ڕابردوودا بەوردی باسمانکرد) چەندین ئەکتەری نوێی چاودێریکردنی دیموکراسی بە ئێمە دەناسێنێت و ئێمە لەم توێژینەوەیەدا تەنها ئاماژە بە سێ ئەکتەری سەرەکی دەکەین. بێگومان دەکرێت لیستەکە درێژبکەینەوە، بەڵام پێمانوایە ئەم سێ ئەکتەرە (لەگەڵ هاوڵاتی وریا و ڕەخنەگر و نمرەبەخشدا) بەشێوەیەکی گشتی گوزارشت لە چوارچێوە گشتییەکە دەکەن و تیشک خستنە سەریان ڕێگامانپێدەدات لە خودی پرۆسێسەکە تێبگەین.

ئەکتەری یەکەم: بزوتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان.

ئەکتەری دووهەم: ئینتەرنێت و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان.

ئەکتەری سێیەم: گروپی تایبەتمەندە جیاوازەکان.

# (١)
# بزوتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان

دنیای کوردی، نە لەسەر ئاستی پراکتیک نە لەسەر ئاستی تیۆری، مێژوویەکی درێژی لەگەڵ بزوتنەوە کۆمەڵایەتییەکاندا نییە. ئێمە نە لە زانکۆکانی کوردستاندا تیۆریزەی بزوتنەوەی کۆمەڵایەتیمان کردووە نە واقیعی کۆمەڵایەتیشمان لە ڕابردووی درێژدا، بەرهەمی ململانێکانی بزوتنەوە کۆمەڵایەتییەکان بووە. تێبینییەکی لەم شێوەیە دەمانگەیەنێتە ئەو باوەڕەی کە باسکردن لە «چیەتی» و «چۆنیەتی» بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی لەسەر ئاستی تیۆری و پاشان تیشک خستنە سەر چەمکی بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی نوێ و دواتر پەیوەستکردنیان بە دنیای کوردییەوە، نەک هەر کارێکی بێهودە نییە بەڵکو فەرمانێکی هەنوکەییشە. گەر بۆ فەرەنسییەک پرسیاکردن لە چیەتی بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی لە ئێستا و ئێرەدا بێ مانابێت، بۆ دنیای کوردیی «دەستلێنەدراوی» ئێمە، نەک هەر پڕ مانایە، بەڵکو پێداویستییەکی تیۆری و پراکتیکیشە.

بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی چیە؟ لە چی هەلومەرجێکدا دروستدەبێت؟ کێ دروستیدەکات؟ بەچی گردبوونەوەیەکی مرۆڤەکان دەوترێت بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی؟ ڕەهەندەکانی بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی کلاسیکی کامانەن؟

لەکوێدا و چۆن و کەی بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی نوێ، لە بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی کلاسیکی جیادەبێتەوە؟ چۆن، کەی، بەچی و لە چ ڕێگایەکەوە بزوتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان دەتوانن چاودێریی دیموکراسی بکەن؟ کوردستان لەکوێی بزوتنەوە کۆمەڵایەتیە نوێیەکاندایە؟ دیموکراسی کوردی چۆن دەتوانێت لەگەڵ سەرهەڵدان و کارابوونی ئەم بزوتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیانەدا مامەڵەبکات؟ ئەم پرسیارانە کۆی ئەو چوارچێوە «ئیشکالییە» پێکدەهێنن کە ڕووبەری لێکدانەوەکانی ئەم بابەتەن و سەرەتا لە پێناسەکردنی بزوتنەوەی کۆمەڵایەتییەوە دەستپێدەکەین.

بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی ئاسایی (کلاسیکی) بریتیە لە کۆی هەموو ئەو دۆخانەی کە گروپێک لە مرۆڤەکان پێکەوە کۆدەکاتەوە و پێکەوە دەیانجوڵێنێت و لەسەر چەند شێوازێکی دیاریکراو ڕەفتاریانپێدەکات. ئامانجی ئەم بزوتنەوە کۆمەڵایەتیانە بریتیە لە گوماندروستکردن لەسەر ڕەهەندێک لە ڕەهەندەکان یان تەواوی ڕەهەندەکانی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی/سیاسی و پاشان هەڵوەشانەوەی و دواتر گۆڕینی بۆ سیستەمێکی دیکە. ستراکتۆری بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی لەسەر بەهای هاوبەش و هاریکاری هاوبەش خۆی بنیادەکات و لە کات و شوێنی پێویستدا و لەپێناوی مەسەلە چارەنوسسازەکان و پرسە باڵاکاندا خۆی «تەعبئە/مۆبیلیزە» دەکات؛ ئەمەش لەڕێگای چەندین چوارچێوەی جیاوازی نارەزاییدەربڕینەوە. لێرەوە بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی دەبێت بە هەڵگری ئەم گریمانانەی خوارەوە:

- **پرۆژەی کۆمەڵگەیی:**

ئەندامانی بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی هەموو ئەو کەسانەن کە خاوەنی پرۆژەیەکی هاوبەشن و لەپێناوی بەدیهێنانیدا «ئەدڤێرسێر/خەسم»ێکیان هەیە و ململانێی لەگەڵدا دەکەن. ئەم «ئەدڤێرسێر/خەسم»ە هەروەک دەکرێت خاوەن کارێک بێت، ئاواش دەکرێت دەزگایەک یان دەسەڵاتی سیاسی بێت. چەند درۆیەکی گەورەیە کە دەوترێت بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی دەستوەرنادات کاروباری سیاسییەوە!، نەک هەرد دەستێوەردەدات بەڵکو بە ڕۆح و لاشەیشیدا دەچێتە خوارەوە و ئێسقان بە ئێسقانی تێکەڵی دەبێت.

- **هاریکاری لەنێوان ئەندامەکانیدا:**

ئەندامانی بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی، لەڕێگای هەستکردن بە ئینتیمایەکی هاوبەشەوە، پەیوەندییەکی دامەزراو لەسەر هاریکاری (سۆلیداریتێ) بەیەکیانەوە دەبەستێتەوە. لەساتەوەختە پێویستەکاندا بەدەمیەکتریەوە دێن و وەڵامی پێداویستییەکانی یەکتری دەدەنەوە. لە سێبەری میکانیزمی هاریکاریدا، ئەندامانی بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی زۆر بە ئاسانی دەتوانن، لە کاتە پێویستەکاندا، «تەعبئەی» خۆیانبکەن و پێکەوە کۆببنەوە. بێگومان بۆئەوەی بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی بتوانێت درێژە بە تەمەنی خۆیبدات، پێویستە چەندین چرکەساتی تایبەتی جۆشدراو بۆ کۆبوونەوە و بەیەکگەشتنی ئەندامەکانی دروستبکات. بەبێ چرکەساتی جۆشدراو بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی ناتوانێت لە مەیدانەکەدا بمێنێتەوە.

- **کەرەسەکانی خۆڕێکخستن و کار:**

چوارچێوەکانی نارەزایەدەربڕینی بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی هەمەجۆر و فرەن: واژۆکردنی بەیاننامە، مانگرتنی گشتی، مانگرتن لە خواردن، یاخیبوونی مەدەنی، داگیرکردنی شوێنی گشتی، داگیرکردنی هێڵی سەرەکی گواستنەوە، لافیتە هەڵواسین، دەرکەوتن لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان، بڵاوکردنەوەی وتار لە ڕۆژنامەکاندا، ڕێکخستنی گەورەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی وەک فەیسبوک، هتد. بێگومان هەر یەکێک لەم ڕووبەرانە سیستەمی ڕێکخستنی دامەزراو لەسەر کۆدی تایبەتی هەیە و بڕیارە بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی دەستەمۆی کردبن.

لێرەوە سەرکەوتنی بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی ڕاستەوخۆ دەلکێت بە توانایی «تەعبئە» کردنی جەماوەرەوە، دەلکێت بە توانایی کۆکردنەوە و هاندان و بەکارهێنانی جەماوەر لەپێناوی بەرگریکردن لە هەڵوێست و بەرژەوەندییە هاوبەشەکانی ئەندامانی بزوتنەوەکەدا. بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی کلاسیکی لە ئاستێکی تەواو بەرزدا ڕێکخراوە و لە ئان و ساتێکدا دەتوانێت زۆربەی ئەندامەکانی بڕژێنێتە سەر شەقامەکان.

بێگومان ئێمە بەتەنها بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتیمان نییە، بەڵکو چەندین بزوتنەوەی کۆمەڵایەتیمان هەیە. سەدەی نۆزدە و بیست مەیدانی سەرهەڵدانی دەیان بزوتنەوەی گەورەی کۆمەڵایەتی تەمەن درێژبوون، بەتایبەتی لە وڵاتە پیشەسازییەکاندا. لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمیشدا چەندین چوارچێوەی دیکەی بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی نوێ سەریانهەڵدا کە کەمتر ماتریالیستبوون و زیاتر لەسەر بەهاکان کاریانەدەکرد. ئەم بزوتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیانە لەبری خۆبیناکردن لەسەر شوناسی چین بە مانا مارکسیەکەی هاتن و خۆیان لەسەر بنەمای

ئینتیما بۆ گروپێکی کۆمەڵایەتی بیناکرد، وەک لەم نمونانەی خوارەوەدا تێبینیدەکەین.

- **بزوتنەوەی فێمینیست:**

ڕاستە لە دوا چارەکە سەدەی بیستەمدا بزوتنەوە فێمینیستەکان بەو پەڕی هێزەوە دەردەکەون و خۆیان بەسەر کێڵگە جیاوازەکاندا فەرزدەکەن، بەڵام ئەوەش ڕاستە کە ڕەگوڕیشەکانی ئەم بزوتنەوانە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شۆڕشی فەرەنسی، بەتایبەتی لە ساتەوەختی جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤەوە؛ کە ئیشکالییەتی یەکسانی نێوان ژن و پیاو وەک دەرهاویشتەیەکی گرنگ تێبینیدەکرێت. هەر لەو ساتەوەختەوە، فەرەنسا، بەریتانیا، ئەمەریکا و چەندین وڵاتی دیکەی پیشەسازی دەبن بە مەیدانی سەرهەڵدانی گفتوگۆی بەهێز لەسەر یەکسانی نێوان ژن و پیاو. لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەبێت بە ڕووبەری سەرهەڵدانی بزوتنەوەیەکی کارای کۆمەڵایەتی بەناوی «بزوتنەوەی ئازادیخوازی ژنان»، کە دەکرێت وەک یەکێک لە دەرکەوتە هەرە توندەکانی بزوتنەوەی فێمێنیست بناسێنرێت. هەروەها لەسەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا و لە فەرەنسادا بزوتنەوەیەکی دیکەی ڕادیکاڵی فێمینیست بەهەمان ناوەوە (بزوتنەوەی ئازادیخوازی ژنان) لەدایکدەبێت. ئامانجە سەرەکییەکانی ئەم بزوتنەوانە بریتین لە: یەکسانی کار و موچە لەنێوان ژن و پیاودا، مافی کۆنترۆڵکردنی لاشەی ژنان لەلایەن ژنان خۆیانەوە، ململانێ دژ بە لاقەکردن، مافی لەباربردنی مناڵ، مافی بەکارهێنانی حەبی مەنع، ململانێ دژ بە ناچارکردنی ئافرەت بە شوکردن، تێکۆشان لەپێناوی بەدەستهێنانی پۆستی سیاسی، هتد.

- **بزوتنەوەی ڕەشپێستەکان:**

ئەم بزوتنەوەیە هیچ پەیوەندییەکی بە ململانێی چینە کۆمەڵایەتییەکانەوە نییە و لەدەرەوەی کارل مارکس خۆی ڕێکدەخات. ئامانجی سەرەکی ئەم بزوتنەوەیە بریتیە لە سڕینەوەی ئەو جیاکارییە سەخت و زەبروزەنگاویەی کە لەنێوان ڕەشپێستەکان و سپیپێستەکاندا دەکرێت. چەند ئەم بزوتنەوەیە سەرکەوتوبێت لە کورتکردنەوەی مەودای نێوان سپیپێستەکان و ڕەشپێستەکاندا، هێندەش لە بەدیهێنانی ئامانجەکانی نزیکدەبێتەوە. ئەم بزوتنەوەیە سەرەتا لە ئەمریکادا سەرهەڵدەدات و پاشان بە وڵاتانی ڕۆژئاوادا بڵاودەبێتەوە.

- **بزوتنەوەی پەراوێزخراوەکان:**

لە کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکاندا پرسی «کەوتنە سەر شەقام» یاخود لەدەستدانی کار کە لە زۆربەی دۆخەکاندا یەکسانە بە لەدەستدانی ماڵ و پاشان هەڵوەشانەوەی خێزان و دواتر لەدەستدانی هەموو شتێک و کەوتنە سەر شەقام، بۆ یەک ساتیش بێدەنگنابێت. ئەم پرسە هەمیشە ئامادەیە، هەمیشە لێرەیە و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە زیادبووندایە. ئەوانەش کە دەکەونە سەر شەقام سەر بە هەموو کاتیگۆرییە کۆمەڵایەتییەکانن. هەر لە مۆسیقارێکەوە بیگرە تادەگاتە کرێکارێک، هەر لە کادرێکی باڵاوە بیگرە تادەگاتە قاپشۆرێک، پێکەوە لەبەردەم گریمانەی کەوتنە سەر شەقامن، کە یەکسانە بە دوورخستنەوە و کەوتنە پەراوێزەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی. لە هەلومەرجێکی ئاوادایە کە وڵاتانی ڕۆژئاوا دەبن بە سەرزەمینی دەیان بزوتنەوەی گەورەی کۆمەڵایەتی کە ئامانجی سەرەکییان بریتیە لە بەرگریکردن لە مافەکانی هەموو ئەوانەی کە دەچنە خانە پەراوێزکراوەکانەوە. ئەم بزوتنەوانە بەهێزن و دەتوانن کاریگەری بەسەر

نوخبەی دەسەڵات و تەنانەت تەواوی کۆمەڵگەشەوە دابنێن، بێگومان کاریگەری دانان مانای چارەسەرکردنی ڕادیکاڵانەی تەواوی کێشەکەنییە، بەڵکو دەرکردنی یاسا و پێداگرتن لەسەر جێبەجێکردنی هەموو ئەو پرۆژانەی کە لەبەرژەوەندی ئەم کاتیگۆرییە کۆمەڵایەتییەدان.

- **بزوتنەوەی کۆچبەران:**

لەدوای جەنگی جیهانی دووەمەوە و بەتایبەتی لە حەفتاکانی سەدی ڕابردووەوە، لە وڵاتانی ئەوروپادا و لە ئاستی جیاوازدا، چەندین بزوتنەوەی کۆچبەران لەدایکدەبن. ئامانجی سەرەکی ئەم بزوتنەوە کۆمەڵایەتییانە بریتیە لە ململانێ لەگەڵ ڕاسیزمدا. ڕاسیزمێک کە کەسی کۆچبەر دەکات بە نیشانە و ڕاستەوخۆ دەیپێکێت. لەم ڕاسیزمەدا کۆچبەر وەک سەرچاوەی هەموو کارەساتەکان، قەیرانەکان، مەترسییەکان، درندەییەکان، لەدەستدانەکان و تاوانەکان دەستنیشاندەکرێت. لە بەرامبەر ڕاسیزمێکی لەم شێوەدایە کە بزوتنەوەی کۆچبەران دەتوانێت، بۆنمونە لە وڵاتێکی وەک فەرەنسادا، زیاتر لە سەد هەزار هاوڵاتی بێنێتە سەر شەقامەکان و گورزی سەخت لە بناغە دامەزراوەکەی ڕاسیزم بدات. تراژیدیای کۆچبەران لەوەدایە کە لە هەر ساتەوەختێکی هەڵبژاردنەکاندا، بەبێ خواستی خۆیان، دەبن بە بابەتی ڕۆژ، بەتایبەتی لای ڕاستڕەوەکان کە دەیانەوێت ئەژدیهایەک، دێوێک لە کەسی کۆچبەر دروستبکەن؛ دێوێک کە لە هەر ساتێکدا دەتوانێت پەلاماری ئەوروپییەک بدات و بە زیندوویی قوتی بدات. فەرەنسییەکی لادێی کە تەنها لە تەلەفزیۆندا کۆچبەری بینیوە، لەبەرامبەر وێنەیەکی لەم شێوەیەدا، زراوی دەتۆقێ و تەنها و تەنها ڕاستڕەوەکان وەک فریادڕەس دەبینێت و ناچار دەنگیان پێدەدات. لێرەوە ئەرکی بزوتنەوە کۆمەڵایەتییەکان چەند هێندەیتر سەخت و ئاڵۆزتر دەبێت.

- **بزوتنەوەی ژینگەپارێزی:**

لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابردووە تا ئێستا و لەسەر ئاستی جیهان سەدان بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی ژینگەپارێز دروستبوون و لە چەندین وڵاتدا خۆیان وەرگێڕاوەتە سەر حزبی سیاسی. ئامانجەکانی سەرەکی ئەم بزوتنەوانە بریتین لە بەرگریکردن لە ژینگە، گەشەکردنی کۆمەڵگەکان لەسەر بنەمای سەرچاوە سروشتییەکان، داهێنانی سەرچاوەی وزەی بەدیل. بەڵام بەپێی گەشەکردنی فیکری و سیاسی ئەم بزوتنەوە کۆمەڵایەتییانە، ئەو ئامانجانەش گەشەدەکەن، بۆنمونە لە ئێستادا بەرگریکردن لەو کەسانەی کە هیچ مافێکی پەنابەرێتیان پێنادرێت و بەبێ «وەرەقە» ناوبانگیان دەرکردووە بووە بە بەشێکی دانەبڕاو لە ئامانجەکانیان، هەر وەک بەرگریکردن لە هۆمۆسێکسیواڵەکان بەشێکی گرنگە لە بەرنامەکانیان.

- **بزوتنەوەی ئەلتەر گلۆبالیزەیشن:**

مێژووی ئەم بزوتنەوەیە دەگەڕێتەوە بۆ هەشتاکانی سەدەی بیستەم، بەتایبەتی ئەو کاتانەی کە سەدان هەزار مرۆڤی ئەوروپی و ئەمەریکی، دژ بە قەرزارکردنی لە ڕادەبەدەری وڵاتانی جیهانی سێیەم لەلایەن بانکی نێودەوڵەتییەوە، خۆیان «تەعبئیە» دەکەن و دەڕێژینە سەر شەقامەکان. لەگەڵ سەرهەڵدانی جیهانگیریدا (گلۆبالیزەیشن)، کە بناغە سەرەکییەکەی بریتیە لە تەماشاکردنی جیهان وەک بازارێکی گەورە، ئەم بزوتنەوەیە زۆر بەهێزتر لەجاران خۆی ڕێکدەخات و بانگەشە بۆ جیهانگیرییەکی دیکەی جیاوازدەکات. جیهانگیرییەکی بیناکراو لەسەر دادپەروەری کۆمەڵایەتی و بەها مرۆییەکان. لەم جیهانگیرییە نوێیەدا پرۆسێسی گەشەکردن بەجۆرێک خۆی بەدیدەهێنێت کە دەکرێت

مرۆڤەکان، بەبێ پێشێلکردنی بەها سەرەکییەکانیان، پشتیوانی لێبکەن، هەروەها دەزگا گەورە جیهانییەکانی وەک سندوقی دراوی نێودەوڵەتی [International Monetary Fun (IMF)] کە وەک حکومەتی جیهانی نوێ ناسراوە و ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی [World Trade Organization (WTO)] دیموکراتیزەبکرێن و بە هەموو توانایەکەوە پشتیوانی لەو وڵاتانە بکرێت کە لەسەر ڕێگای گەشەکردنی ئابوورین.

فرەیی بزوتنەوە کۆمەڵایەتییەکان یەکسان نییە بە لێکچوون و هەماهەنگیەیکی ئۆتۆماتیکی لەنێوانیاندا. بەپێچەوانەوە، چەند ئەم بزوتنەوانە فرە جۆربن، هێندەش ئامادەیی گریمانەی لێکدژی لەنێوان ئامانجەکانیاندا بەهێزتر دەبێت. دەکرێت بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی بەناوی شەرعیەتی پارێزگاریکردن لە ژینگەوە، زۆر بەتوندی دژایەتی بەکارهێنانی ئۆتۆمۆبیل بکات، بەڵام لەهەمانکاتدا بزوتنەوەیەکی دیکە بەناوی شەرعیەتی کار و پارێزگاریکردن لە کرێکارانەوە، بەتوندی بەرگری لە بەرهەمهێنانی ئۆتۆمۆبیل بکات. واتە ئامادەیی چەند بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی لە ڕووبەرێکدا مانای یەکێتی ئامانج و بەرنامە و میتۆدەکانیان نییە، بەپێچەوانەوە، مانای ئامادەبوونی بەرگریکردنە لە بەرژەوەندی جیاواز، خەونی جیاواز و چاوەڕوانی جیاواز.

بزوتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان، تەواو بەپێچەوانەی تێزەکانی کارل مارکسەوە کە پێیوابوو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر بنەمای «ئیستیغلال» دامەزراون، دێن و وەک ماکس ڤێبەر مامەڵە لەگەڵ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دەکەن؛ بەومانایەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەشێوەیەکی گشتی لەسەر بنەمای «هەیمەنە» خۆیان

بینادەکەن. لەم ڕوانگەیەوە ململانێی سەرەکی ئەوان چیدی لەپێناوی دابەشکردنەوەی داهاتدا نییە، بەڵکو لەپێناوی دابەشکردنی دادپەروەرانەی دەسەڵاتدایە. بێگومان لەنێو ئەم چوارچێوە گشتییەدا دەکرێت چەندین ڕەگەزی ڕیزپەڕ «ئیستیسنا»ش بدۆزینەوە. واتە تابلۆکە بەتەنها یەک ڕەنگی نییە، هەرچەند مۆرکە سەرکییەکەی ڤێبەرییە تا مارکسی.

ئالان تورێن، سۆسیۆلۆگی گەورەی فەرەنسی، لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردووەوە، سێ بنەمای سەرەکی بۆ دروستبوونی هەر بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی، لەنێو کۆمەڵگە پۆست پیشەسازییەکاندا دەسنیشانکردووە کە دەکرێت وەک چوارچێوەیەکی گشتی و فراوان بۆ ناسینەوەی بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی بەکاربهێنرێن.

- **بنەمای یەکەم: شوناس**

ئەم بنەمایە پرسیاری «کێ ململانێ دەکات؟» لە خۆی دەکات. شوناس بریتیە لەو شتەی کە گروپێک خۆی پێ پێناسەدەکات و پاشان لەلایەن بەرامبەرەکانییەوە بەو «شتەوە» دەناسرێتەوە. شوناسە دەستەجەمعییەکان دەکرێت لەسەر بناغەی پیشە، ئەسڵی کۆمەڵایەتی، تەمەن، سێکس، ئینتیمای ئاینی یان ئیتنی خۆیان دابمەزرێنن. ئەندامانی هەر گروپێک وشیارن بەو شوناسەی کە خۆیان بەهەڵگری دەزانن. واتە بەبێ وشیاری لەسەر شوناسی هەڵگیراو، گردبوونەوەیەکی بەشەری ئەستمە بتوانێت خۆی وەربگێڕێتە سەر بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی.

- **بنەمای دووەم: ئۆپۆزسیۆن**

گەر بنەمای شوناس بە پرسیاری «کێ ململانێ دەکات؟» دەستپێبکات، بنەمای ئۆپۆزسیۆن کار لەسەر پرسیاری « کێ ململانێ دەکرێت؟» دەکات. واتە بەرامبەری بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی کێیە؟ ئالان

تورێن پێیوایە گردبوونەوەیەکی بەشەری نابێت بە بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی گەربێتو نەتوانێت ناوی ئەو بەرامبەرەی دەستنیشانبکات کە هەڵگری سیستەمێکی دیکە لە بەهایە و ئامادەیە بەرگری لێبکات. لێرەوە ململانێ دەبێت بە منداڵدانی دروستبوونی ئەویتری بەرامبەر و بیناکاری وشیاری ئەکتەرە کۆمەڵایەتییەکان.

- **بنەمای سێیەم: گشتگیری (تۆتالیتێ)**

پرسیاری سەرەکی بنەمای سێیەم بریتیە لە «ململانێ لە پێناویچیدا؟». دیسانەوە تورێن پێیوایە کە بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی لەپێناوی کۆنترۆڵکردنی ئاڕاستەی ڕووداوە گەورەکانی کۆمەڵگەیەکدا ململانێ دەکات و ئەمەش ناودەنێت دروستکردنی مێژوو. کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵگە بەشێوەیەکی تۆتال/گشتگیر بەو مانایەی کە بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی دەیەوێت. من پێموایە ئەم بنەما تۆرێنییە جێگای گفتوگۆیە و ئەستەمە کە بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی بتوانێت بەتەواوی کۆنترۆڵی کۆمەڵگەیەک بکات و لە چرکەساتی کۆنترۆڵکردنیشیدا دەکرێت کارەساتی گەورە دروستبکات. پێموایە لەهەر شوێنێک هێزێکی کۆمەڵایەتی یان سیاسی هەژمونبکات بەسەر تەواوی ڕووبەرەکانی کۆمەڵگەیەکدا، لەو شوێنەدا گریمانەی تۆتالیتاریزم و دیکتاتۆریەت تەواو بەهێزە[٣٥].

ئایا لە کوردستاندا بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی، بەو شێوەیەی کە زانستە کۆمەڵایەتییەکان باسیانکردووە، ئامادەیە؟.

من پێموایە لە کوردستاندا بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی کلاسیکیمان نییە. واتە بزوتنەوەیەک کە لەسەر ململانێی چینایەتی بەمانا مارکسیەکەی خۆی پێکهێنابێت. کۆمەڵگەی کوردی بەبێ ئەوەی بە قۆناغی پیشەسازی مەزندا تێپەڕیبێت، بەگۆشت و ئێسقانەوە پێیناوەتە نێو قۆناغی جیهانگیرییەوە. لەم قۆناغەدا چەند ڕەوتی دیموکراسی کوردی بەرەوپێشەوەبێچێت، هێندەش ڕەوتی سەرهەڵدانی بزوتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان بەرەوپێشەوە دەچێت. لەهەلومەرجێکی ئاوادا، ئێمە دەتوانین سەرەتاکانی سەرهەڵدان و دەرکەوتنی شەرمنانەی چوار بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی کوردی دەستنیشانبکەین[٣٦].

- **یەکەم: بزوتنەوەی ژنان**

ئێمە درۆیەکی گەورەدەکەین گەر پێمانوابێت کە بزوتنەوەی ژنانی کوردی لە ئاستی بزوتنەوەی ئازادیخوازی ئەمەریکی یان فەرەنسیدایە. بەڵام درۆیەکی گەورەتر دەکەین گەر پێمانوابێت بزوتنەوەی ئازادیخوازی ژنانی کوردی بوونی نییە (وەک بەشێک لەڕۆشنبیران باسیدەکەن). ئەم بزوتنەوەیە نەک هەر بوونی هەیە، بەڵکو تا ئاستێکی تێبینیکراو توانای تەعبئەکردنی هەموو ئەو کەسانەی هەیە کە بەرگری لە مافی ژنان بەگشتی و یەکسانی ژن و پیاو بەتایبەتی دەکەن.

---

[٣٦] خوێنەر ئاگاداردەکەمەوە کە کتێبی داهاتومان تەرخانە بۆ توێژینەوەیەکی مەیدانی قوڵ لەسەر سێ مەیدان: هەلومەرجی ژن لە کوردستاندا، نەوەی نوێی کوردستانی پاش ڕاپەڕین، شوناسی ئیسلامییەکان لە یادەوەری عەلمانییەکاندا و شوناسی عەلمانییەکان لە یادەوەری ئیسلامییەکاندا. بۆیە لە ئێستا و ئێرەدا تەنها سەرەداوەکان دەخەینە بەردەست خوێنەران و ناڕۆینە نێو وردەکارییەکانەوە.

- **دووەم: بزوتنەوەی ڕۆشنبیران**

بەهێزتر لە بزوتنەوەی ژنان، پێموایە بزوتنەوەی ڕۆشنبیرانی کوردی لە ئاستێکی بەرزتردا توانای «تەعبئەکردنیان» هەیە و کایگەرییان بەسەر چۆنیەتی دروستکردنی بڕیارەوە فاکتێکی تێبینیکراوە. بەشێکی زۆری ئەم بزوتنەوەیە لە هەموو ئەو کەسانە پێکدێت کە دەکرێت بە وردە ڕۆشنبیر ناویانبەرین؛ بەومانایەی کە ناوی گەورە نین و بەرهەمی گەورەیان نییە، بەڵام کۆبوونەوەیان لە بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتیدا هێزێکی تایبەتیان پێدەبەخشێت.

- **سێیەم: بزوتنەوەی خوێندکاران**

قەیرانی سەرەکی بزوتنەوەی خوێندکاران بریتیە لە ئیشکالیەتی حیزبیبوون. واتە بەشێکی زۆر لەو ڕێکخراوانەی کە بڕیارە نوێنەرایەتی خەون و خواستەکانی خوێندکاران بکەن، لەبناغەدا حیزبین و کار لەسەر کۆنترۆڵکردنی خەون و خواستەکانی خوێندکاران دەکەن. لەپەنای ئەم قەیرانە بەهێزەشدا، هەستبەوەدەکەین کە لە ئاستێکی تەواو نزمدا، شتێک بەناوی بزوتنەوەی خوێندکاران هەیە و هەوڵدەدات لە حیزبیبوون بێتەدەرەوە. من دڵنیام لەوەی کە لەگەڵ بەرەوپێشوچونی دیموکراسیدا، ئەم ڕێکخراوانە گەر خۆیان یەکلاییەکەنەوە و نەبن بە نوێنەری ڕاستەقینەی خوێندکاران، لەناودەچن و جێگا بۆ دروستبوونی ڕێکخراوی دیکەی بابەتییانە چۆڵدەکەن.

- **چوارەم: بزوتنەوەی لاوان**

بزوتنەوەی لاوانیش هەڵگری هەمان قەیرانی بزوتنەوەی خوێدنکارانە و لە هەمان قۆناغی ئەودایە و هەمان گریمانەی ئەویشی لەبەردەستدایە. لەکاتێکدا دەکرا ئەو هەزاران هەزار لاوە کوردەی کە بەرەڵای نێو

کۆڵانەکانی جیهانگیری کراون، خۆیان ڕێکبخستایە و بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی بەهێزیان دروستبکردایە، بەپێچەوانەوە، ئەوان شەرمنترین و لاوازترین بزوتنەوەی کۆمەڵایەتین لە کوردستاندا، هەرچەند دڵنیام لەوەی کە ئەم شەرمنی و حیزبیبوونە لە داهاتودا بەردەوامنابێت و گریمانەی کارابوونی ئەم بزوتنەوەیە تەواو بەهێزە.

ئایا ئەم چەند دێرە بەسە بۆئەوەی کە ئێمە لەو چوار بزوتنەوە کۆمەڵایەتیە کوردییە تێبگەین؟ بێگومان نەخێر. تەنها توێژینەوەیەکی مەیدانی سۆسیۆلۆژی لەسەر هەردوو ئاستی چۆنایەتی و چەندایەتی ڕێگامانییدەدات کە ببین بە خاوەنی مەعریفەیەکی بابەتییانە لەسەر ئەم بزوتنەوە کۆمەڵایەتیانە و ئەمەش ئیشکالیەتی سەرەکی ئەم توێژینەوەیەی ئێمە نییە. ئەوەی ئێمە بەدوایدا دەگەڕێین شتێکی دیکەیە کە دەکرێت ناویبنێین: ڕۆڵی ئەم بزوتنەوە کۆمەڵایەتییانە لە چاودێریکردنی دیموکراسی کوردیدا.

بایەخی سەرەکی بزوتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان بۆ ئەم توێژینەوەیەی ئێمە لەوەدایە کە هەر یەکێک لەم بزوتنەوانە (ژنان، ڕۆشنبیران، خوێندکاران، لاوان) دەتوانن لەیەککاتدا ئەکتەری هەر سێ میکانیزمی چاودێریکردنی دیموکراسیبن: وریابوون، ڕەخنەگرتن، نمرەبەخشین. ئەم بزوتنەوانە هەمیشە لەسەرپێن، وریان، بەخەبەرن و بەوردی چاودێری جومگە بە جومگەی ئەو نوخبەیە دەکەن کە لە دەسەڵاتدان. دەکرێت لێرەدا نمونە بە ئەو پرۆژە یاسایە بێنینەوە کە پەیوەندی بەڕۆژنامەنوسانەوە هەبوو. هەر لەسەرەتای ئەم پرۆژەیەوە، بزوتنەوە کۆمەڵایەتییەکان بەگشتی و بزوتنەوەی ڕۆشنبیران بەتایبەتی، بەو پەڕی وریاییەوە ئەم پرۆژەیەی خستە ژێر چاودێریەوە. لە قۆناغی

دووهەمیشدا دەیان ڕەخنەی بابەتییانەی لێگرت و لە قۆناغی سێیەمیشدا نمرەی باشی و خراپی پێبەخشی. لەدەرئەنجامدا کاریگەری ڕاستەوخۆی بەسەر پرۆژەکەوە دانا.

ئەم بزوتنەوە کۆمەڵایەتییانە، بەپێچەوانەی بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی کرێکارانەوە کە لە سەدەی ڕابردوودا دەیوسیت خودی سیستەمەکە هەڵبوەشێنێتەوە و دەسەڵات بگرێتە دەست، هەروەها بەپێچەوانەی حیزبەکانی ئۆپۆزسیۆنەوە کە دەیانەوێت بە هەر ڕێگایەک بووە حیزبی دەسەڵاتدار شکستپێبێنن، دەیانەوێت چاودێربن بەسەر ئەو نوخبەیەوە کە پێشئەوەی بگات بە دەسەڵات دەیان پرۆژە و ئامانجی پێشنیارکردووە و سەدان بەڵێنی بە هاوڵاتیان داوە. چاودێریکردنی ئەم نوخبەیە بەمەبەستی ئەوەیە کە تا چەند پرۆژەکانی، بەڵێنەکانی جێبەجێدەکات و تا چەند مەودای نێوان تیۆری و پراکتیک کورتدەکاتەوە.

ئەم بزوتنەوانە دەتوانن پەردە لەسەر گەندەڵی لابدەن، درۆکان بخەنە بەر خۆر، لادانەکان دەستنیشانبکەن، ناتەواوییەکان بنوسنەوە، ببن بە گروپی پاڵەپەستۆ، پرۆژە یاساکان بپشکنن، جەماوەر بێننە سەر شەقامەکان، سەرکردایەتی مانگرتنەکان بکەن و دەیان ڕێگای دیکە بگرنە بەر. لەئامادەبوونی بەهێزی ئەم بزوتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیانەدا کۆمەڵگەی کوردی دەتوانێت گەشبینبێت بە داهاتوی دیموکراسی، بەبێ ئەوەی ئەرزشدابنێت بۆ ئەوەی کێ لە دەسەڵاتدایە و کێ هەڵبژاردنەکان دەباتەوە.

بێهودەنییە کە یەکێک لە سیفەتە بەناوبانگەکانی دەوڵەتە شمولییەکان بریتیە لەوەی کە بەهیچ شێوەیەک و لە هیچ هەلومەرجێکدا ڕێگانادەن بە دروستبوونی بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی. لە وڵاتێکی وەک کۆریای باکوردا،

هەر قسەکردنێک لە بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی یەکسانە بە لە سێدارەدان، لە وڵاتێکی وەک چیندا، ساڵی ١٩٨٩ بزوتنەوەی خوێندکاران کە تەنها خۆپیشاندانێکی ئەنجامدا، لەنێو خوێن و ئاگر و ئاسندا کۆتاییپێهات. ئەو قەسابخانەیەی کە نوخبەی دەسەڵاتداری چینی، لەنێوان ١٥ ئەڤریل ١٩٨٩ و ٤ ژون ١٩٨٩ دا دروستیکرد، تا ئێستاش برینەکانی سارێژنەبوون. چەند دەسەڵاتێکی سیاسی زەبروزەنگ بەرامبەر بە بزوتنەوە کۆمەڵایەتییەکان بەکاربێنێت، هێندەش لە ڕۆحی دیموکراسی دووردەکەوێتەوە و لە تۆتالیتاریزم نزیکدەبێتەوە.

لێرەوە یەکێک لە هۆڵەکانی تاقیکردنەوەی دیموکراسی کوردی بریتیە لە مەمەڵەکردنی لەگەڵ بزوتنەوە کۆمەڵایەتییە کوردیەکاندا. دیموکراسی تەنها کۆمەڵێک دروشم نییە کە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان بەردەوام دووبارەبکرێنەوە، بەڵکو کۆمەڵێک پراکتیکی ژیانی ڕۆژانەشە و بەبێ ڕێزگرتن لێیان، دروشمە تیۆرییەکان، یەک لەدوای یەک بەتاڵدەبنەوە.

# (٢)
# تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی سەر ئینتەرنێت

کامەیە سروشتی ئەو پەیوەندییە ئەفسوناویەی کە لە سەدەی نوێدا دیموکراسی و ئینتەرنێت پێکەوە دەبەستێتەوە؟ لە سەردەمی هەژمونی ئینتەرنێتدا چۆن و بەچ ڕێگایەک دیموکراسی دەتوانێت خۆی بەدیبێنێت؟ چۆن و کەی و لەکوێدا ئینتەرنێت دێت و ڕووبەرەکانی چاودێریی دیموکراسی بینادەکات؟ کامانەن ئەو بنەمایانەی کە ئەکتەرە کۆمەڵایەتییەکان، لەچرکەساتی بەکارهێنانی ئینتەرنێتدا، بەکاریاندەهێنن و کاریان لەسەردەکەن؟...

بەسنوری درێژبوونەوەی لیستی پرسیارەکان و دەرکەوتنیان لە ئاستی جیاوازدا، لیستی وەڵامەکانیش درێژدەبێتەوە و لە ئاستی جیاوازدا دەردەکەون. چەند پرسیارەکان هەڵگری لێکدژیبن، هێندەش وەڵامەکان هەڵگری هەمان ئاست و جۆری لێکدژین.

ئینتەرنێت بەتەنها «شتێک» لە شتەکان نییە تا وەک یەکەیەکی گونجاوی گونجاوکار مامەڵەی لەگەڵدا بکەین. بەڵکو لەیەککاتدا چەند شتێکە: ئینتەرنێت کەرەسەیەکی تەکنیکیە، میدیایە، پانتایی گشتییە، چەکێکی سیاسییە، پەیوەندی کۆمەڵایەتییە، دروستکەر و

هەڵوەشێنەرەوەی خێزانە، ڕووبەری پەروەردەی بەرزە، ڕووبەری بەیەک گەشتنی فرۆشیار و کڕیارانی سێکسە، بازاڕێکی نوێی گەورەی ناوخۆیی و ناوچەیی و جیهانییە، ...، بەکورتی ئینتەرنێت هەموو ئەو شتە لێکدژە بێ سنورانەیە کە کۆمەڵگەکان بەگشتی و نەوەی نوێ بەتایبەتی بە گۆشت و ئێسقانەوە تێکەڵی دەبێت.

بێگومان ئەوەی لێرەدا ئیشکالیەتی ئێمەیە، هەموو ئەو ڕووبەرە لێکدژانە نین کە نیشتمانی نوێی ئینتەرنێت پێکدەهێنن. هەرچەند ئەمە دەکرێت وەربگێردرێتە سەر توێژینەوەیەکی وردی سۆسیۆلۆژی، بەڵام ئەوەی کە ئێمە بەدوایدا دەگەڕێین، پەیوەندی ئینتەرنێتە بە دیموکراسیەوە. ئینتەرنێت پێشئەوەی هەرشتێک بێت، پێشئەوەی هەر کارێک بکات، پێشئەوەی هەر ڕووبەرێک دروستبکات، دەتوانین وەک بەڵگە نەویستێک بڵێین: گەدەی هەرسکردنی کۆدەکانی سیاسەتە، دروستکردنی کەرەسەکانی چاودێریکردنی دیموکراسییە، چوارچێوەی کۆنترۆڵکردنی نوخبەی دەسەڵاتە، کردنەوەی زمانی هاوڵاتی بێزمانە و هەموو ئەمانەش وامانلێدەکات کە ئەستەمبێت لە ئێستا و ئێرەدا بتوانین وێنای کۆمەڵگەیەکی سیاسی و دیموکراتیک بەبێ ئینتەرنێت بکەین.

لەنێو هەموو ئەم پراکتیکە فرە، جیاواز، لێکدژەی کە ئینتەرنێت و سیاسەت، ئینتەرنێت و دیموکراسی پێکەوە دەبەستێتەوە، ئێمە چوار بنەمای سەرەکی بۆ تێگەشتن لە سروشتی ئەم پەیوەندییە، لە ستراکتۆرەکەی، لە چۆنیەتی کارکردنی، لە دەرەنجامەکانی پێشنیاردەکەین. بێگومان هەریەکێک لەم چوار بنەمایە دەکرێت ژێرە بنەمایان هەبێت، بەڵام بۆ دروستکردنی چوارچێوەیەکی «کۆنسێپتیول/چەمکگەرا»ی گشتی ئێمە لە سنوری هێڵە گشتییەکاندا

دەمێنینەوە. بنەما گشتییەکانیش بریتین لە: بنەمای یەکسانی، بنەمای خودگەرایی، بنەمای خوارەوەی کۆمەڵگە، بنەمای خێڵە نوێیەکان.

● **بنەمای یەکسانی:**

یەکێک لە دروشمە مێژووییەکانی دیموکراسی مۆدێرن بریتیە لە بنەمای یەکسانی لەنێوان هاوڵاتیاندا. دیموکراسی هەمیشە خۆی وەک سیستەمی هەموو ئەو کەسانە خستوەتە سەر شانۆ کە چانسی قسەکردنیان لە پانتاییە گشتییەکاندا لە ئاستێکی نزمدایە. گەر لەم گۆشەنیگایەوە بۆ ئینتەرنێت بڕوانین، دەتوانین بە ئاسانی تێبینی ئەوەبکەین کە ئەم دروشمە مێژووییەی دیموکراسی، ئەم ئایدیالەی دیموکراسی لە نیشتمانی ئینتەرنێتدا گەشتوەتە لوتکە. واتە ئینتەرنێت نەک هەر بەیەکسانی مافی قسەکردن بە کۆی هاوڵاتیان دەبەخشێت، بەڵکو مافی چاودێریکردنی دیموکراسی و ڕەخنەلێگرتنی و پاشان سزادانیشی وەک یەک بە کۆی هاوڵاتیان دەبەخشێت. وەک چۆن لەبەردەم خوادا هەموو مرۆڤەکان یەکسانن، ئاواش لەبەردەم ئینتەرنێتدا سۆسیۆلۆگێک و شوانێک، سەرۆکی کۆمار و تەماتەفرۆشێک، ژەنەراڵی سوپا و شاعیرێکی هەستناسک، ئیپیستمۆلۆگێک و گاوانێک یەکسانن.

بەڵام یەکسانی مانای یەک ئاستی نییە، یەکسانی مانای یەک پێگەیی نییە! ڕاستە لەسەرەتاوە و کاتێک هەمووومان لە سەر سنوری نیشتمانی ئینتەرنێتین، هیچ ئەرزشێک بۆ پێگە کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابووری و ئاینییەکانمان دانانرێت، بەڵام ئەوەش ڕاستە کە، لەڕێگای ئەوەی کە دواتر لە نیشتمانی ئینتەرنێتدا دەینوسین، ئەنجامیدەدەین و بەرهەمیدەهێنین، بەشێوەیەکی خۆڕسکانە، جۆرێک لە پلەبەندی دروستدەبێت. ئەم پلەبەندییە پەیوەندی بەوەوە نییە کە تۆ چیت، بەڵکو پەیوەندی بەوەوە

هەیە کە تۆ چیدەکەیت! واتە، بۆئەوەی ئەرزشت بۆدابنێت ئینتەرنێت پرسیاری ئەوە لەتۆ ناکات کە تۆ چیت، بەڵکو پرسیاری ئەوەت لێدەکات کە تۆ چیدەکەیت.

لێرەوە، هەموو ئەوانەی کە ئینتەرنێت بەکاردەهێنن لە هەوڵی تاقیکردنەوەی بەردەوامی خودی ئینتەرنێتدان؛ بەو مانایەی کە هەر یەکێک لە ئێمە دەتوانێت تواناکانی خۆی تاقیبکاتەوە و خۆی وەک ئەکتەری یەکەمی ژیانی خۆی بسەلمێنێت و پاشان ببێت بە «ڕەقیب»ێکی هەمیشەیی بەسەر دنیای دەوروبەریەوە، بەتایبەتی دەوروبەری سیاسی. ڕەقیبێک کە خاوەنی دەسەڵاتی ڕەتکردنەوەی سیفەتەکانی وەک باوک، براگەورە، زانا، ڕاعی، سەرۆکە و هەموو چاودێریکراوەکان تەنها وەک هاوڵاتی و لە ئاستی خۆیدا دەبینێت. بۆئەوەی گوزارشت لەخۆی بکات، ئەویتر وەک پێگە نابینێت، بەڵکو وەک کەسێک کە پێیدەوترێت مرۆڤێکی یەکسان بە هەموو ئەوانیتر!.

ڕەنگە هەندێک پێیانوابێت بنەمای یەکسانی بریتیە لە دروستکردنی هەلومەرجی گەڕەلاوژەیی بێ مانا! ڕەنگە ئەمە تا ڕادەیەک ڕاستبێت، هەر بۆیە لەهەر بستێکدا یەکسانی ئامادەبێت، کارکردنیش بۆ نرخاندنی گیانی «بەرپرسیاری» لای تاکەکان ئامادەیە. بارودۆخی ئایدیالی ئینتەرنێت بریتیە لە تاکی یەکسان، کە دەمانبات بۆ تاکی بەرپرسیار، کە دەمانابت بۆ تاکی هەڵوێستدار. بێهودەنییە کە لەسەر تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان جەنگێکی هەمیشەیی لەنێوان دەنگدار و بێدەنگەکان، هەڵوێستدار و بێهەڵوێستەکان، بەرپرسیار و نابەرپرسیارەکاندا لەئارادایە. بێهودەنییە کە چالاکەکانی نێو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بەردەوام سەرگەرمی بێ بەهاکردنی مرۆڤە نەرمەکانن.

ئایا بنەمای یەکسانی مرۆڤەکان لەبەردەم ئینتەرنێتدا ڕەنگدانەوەی واقیعێکی کۆنکرێتی کۆمەڵایەتییە؟ بێگومان نەخێر. ئەم بنەمایە ڕەنگدانەوەی ئایدیالێکە کە «مونەزیرەکان/تیۆریستەکان»ی ئینتەرنێت، لەسەر هەمان میتۆدۆلۆژیای ڤێبەری، دەستنیشانیدەکەن. گەرنا لە ساتەوەختی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ تۆڕێکی کۆمەڵایەتیدا، بۆنموونە فەیسبوک، تەواوی نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکان، کە سەرمایەی ڕەمزی هەر تاکێک بە میتۆدۆلۆژیە بۆردیۆیەکەی پێکدەهێنن، خۆیان دەخەنە بەر خۆر و بەڕونی تێبینی دەکرێن. مامەڵەی کچێک لەگەڵ فەیسبوکدا کە بەکالۆریۆسی تەواونەکردووە، باوک و دایکێکی نەخوێنەواری هەیە، لە گەڕکێکی داڕزاودا دەژی، سنوری جوڵانەوەی سێ کۆڵان تێناپەڕێنێت، بەهیچ شێوەیەک هەمان مامەڵەی کچێکی دیکە نییە کە دکتۆرای لە ئەدەبی ئینگلیزیدا هێناوە، باوکی پارێزەرە، دایکی مامۆستایە، لەگەڕەکێکی ڕاقی شاردا دەژی و هەڵگری هەردوو جنسیەی عێراقی و هۆڵەندییە و تێکۆشان لەپێناوی بەدیهێنانی دروشمە فێمێنیستییەکاندا هەموو ژیانی داگیرکردووە. ڕاستە کە لەبەرامبەر ئینتەرنێتدا ئەم دوو کچە یەکسانن، بەڵام ئەوەش ڕاستە کە تەواوی نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکان، تەواوی نایەکسانی سەرمایە ڕەمزییەکانیان، لە چرکەساتی چاودێریکردنی دیموکراسیدا (وریایی، ڕەخنەگرتن، نمرەبەخشین) خۆیان دەردەخەن. ئێمە دەتوانین گوزارشتێکی دیکە بەکاربێنین کە دەکرێت بەمشێوەیە دایڕێژین:

یەکسانی لەبەردەم ئینتەرنێتدا تەواوی نایەکسانییە شاراوە کۆمەڵایەتییەکانی پێ لەنێو نابرێت، بەڵام لەڕێگای بەشداریکردنی چرکەساتی هەموانەوە، دەتوانێت تا ئاستێکی بەرز کەمیانبکاتەوە.

چەمکی هاوبەشیکردن دوو فەرمانی هەنوکەیی دەسەپێنێت. فەرمانی یەکەم پەیوەندی بە سەرمایەی ڕەمزی بەهێزەوە هەیە و داوایلێدەکرێت، لە کاتی گوزارشتکردن لەخۆیدا لە عەرشی زمانە سەختە زانستییەکان بێتە خوارەوە و بەجۆرێک بدوێت کە هەموو لایەک تێبگەن. فەرمانی دووهەمیش پەیوەندی بە سەرمایە ڕەمزییە لاوازەکانەوە هەیە و داوایلێدەکرێت کە لە کاتی گوزارشتکردن لە خۆیدا زمانە بازاڕییەکەی بەجێبێڵێت و خۆی بۆ ئاستێکی قبوڵکراو بەرزبکاتەوە. دەکرێت لە ڕێگای ئەم دوو فەرمانەوە، بەشێوەیەکی ڕێژەیی، دەستکاری هەردوو سەرمایە ڕەمزییەکە بکرێت و نزیکبوونەوە لە بنەمای یەکسانی ببێت بە گریمانەیەکی «مومکین».

- **بنەمای خودگەرایی**

پێش سەرهەڵدانی ئینتەرنێت، کەرەسە گشتییەکانی گەیاندنی وەک ڕۆژنامە، کتێب، ڕادیۆ، تەلەفزیۆن، لە ئاستی جیاوازدا پانتایی جیاکردنەوەی مرۆڤەکان بوون. هەر یەکێک لەو کەرەسانە سیستەمێکی تایبەت بە خەتهێنان بە ژێر ناوەکاندا هەبوو! بێگومان خەتهێنان بەژێر ناودا ڕاستەوخۆ دەمانباتەوە سەر چەمکی پەراوێزخستن، چونکە پێماندەڵێت: کێ مافی ئەوەی هەیە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان، لەنێو ڕۆژنامەکاندا، لەسەر ئەنتێنی ڕادیۆکان دەرکەوێت و قسەبکات و کێش ئەو مافەی نییە. کێن ئەوانەی شایستەی نمایشکردنن و کێن ئەوانەش کە دەبێت پەردەپۆشبکرێن. کێن ئەوانەی دەزانن زمانی گوزارشت لە خۆیان بەکاربێنن و کێن ئەوانەش کە ئەم زمانەیان نییە. لە هەلومەرجێکی ئاوادا بەتەنها نوخبەیەکی کورتکراوە دێن و کۆنترۆڵی هەموو کەرەسەکانی ڕاگەیاندن دەکەن. نوخبەیەکی بچوکی قسەکەر و جەماوەرێکی گەورەی

گوێگر، نوخبەیەکی کەمینەی بینراو و جەماوەرێکی زۆرینەی شاراوە! نوخبەیەکی چاودێر بەسەر دیموکراسییەوە و جەماوەرێکی خەوتو لەنێو دیموکراسیدا!.

ئەوەی ئینتەرنێت دەیکات کۆتاییهێنانە بەم مێژووە، بەم پرۆژەیە، بەم نوخبەیەی کە بەدرێژایی تەمەنی کاری لەسەر دوورخستنەوە و پەراوێزخستن کردووە. کۆتاییهێنان بەم مێژووە لەهەمانکاتدا سەرەتای دامەزراندنی شتێکی دیکەیە کە دەکرێت ناویبنێین «ئازادکردنی خود»ەکان و پێنانە نێو ڕووبەرەکانی خودگەراییەوە. ئینتەرنێت دەرگا لەسەر هەموو ئەکتەرەکاندەکاتەوە، هەموو خودە جیاوازە کۆمەڵایەتییەکان تا وەک ئەوەی کە هەن گوزارشت لە تاقانەیی، لە تاکێتی، لە خودگەرایی خۆیان بکەن. تۆڕەکانی سەر ئینتەرنێت مەیدانی بەریەککەوتن و تێکەڵبوون و جیابوونەوەی خودە جیاوازەکانە، پانتایی دەرکەوتنی ئەو زۆرینەیەیە کە میدیا کلاسیکییەکان دەیانشاردەوە وەک ئەوەی شەرمبکەن لە قسەکردنیان، لە زمانیان، لە دەربرینەکانیان! لێرەبەدواوە بەتەنها ڕۆژنامەوانێک، نووسەرێک، ڕۆشنبیرێک، هونەرمەندێک قسە لەسەر پراکتیکە جیاوازەکانی نوخبەی دەسەڵات ناکات، بەتەنها ئەم ئەکتەرە چاودێر نییە بەسەر نوخبەی دەسەڵاتەوە، بەڵکو تەواوی کۆمەڵگەی سەر ئینتەرنێت ئەم ڕۆڵەدەبینێت. لەوەش زیاتر، ئەو پەراوێزخراوەی کە تا دوێنێ مافی ئەوەی نەبوو لە دوا لاپەڕەی ڕۆژنامەیەکیشدا ستونێک لەسەر بابەتی نووسەرێک یان پراکتیکی سیاسییەک بنوسێت، لە ئێستای ئینتەرنێتدا، نەک هەر دەنوسێت، بەڵکو دەتوانێت ڕاستەوخۆ گفتوگۆشیان لەگەڵدا بکات.

لەپەنای دەرکەوتنی ڕووتوقوتی خودەکاندا، ئینتەرنێت چەندین ڕووبەری دیکەی لاستیکی، ناشەفاف، ئاڵۆز، ماسکگەرا دەخاتە بەردەم تاکەکان، بەڕادەیەک کە هەر کەسێک دەتوانێت لەیەککاتدا هەڵگری زیاتر لە شوناسێکبێت. گەر لەپانتاییە گشتییە کلاسیکییەکاندا ئێمە بەتەنها هەڵگری شوناسێکی فیزیکی بووبین، لەپانتاییە گیشتییە ڤێرتیوڵەکانی ئینتەرنێتدا دەتوانین ئەو شوناسە فیزیکییە بکەین بە چەندین پارچەوە. ڕاستە ئەم پارچە پارچەبوونەی شوناس جۆرێک لە ناشەفافی دروستدەکات، بەڵام ئەوەش ڕاستە کە دەسەڵاتی چاودێریکردن و کۆنترۆڵکردنی دیموکراسی و نوخبەی دەسەڵات لەلایەن کۆمەڵگەی مەدەنییەوە بەهێزتر و کاراتر دەکات. بێهودەنییە کە نوخبەی دەسەڵات، پێشئەوەی هەر هەنگاوێک بنێت، چاوێکی لەسەر فەیسبوک و تویتەر و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانە. بێهودەنییە کە لەژێر کارایی بڵاوبوونەوەی گرتەیەکی ڤیدیۆیدا و دەستاودەستپێکردنی لەسەر تۆڕی فەیسبوک، بەرپرسێکی باڵای حکومەت ئامادەیە نەک هەر پێشوازی لەو هاوڵاتیە بکات کە بووە بە بابەتی ئەو گرتە ڤیدیۆییە، بەڵکو ئامادەشە بە کاروانی ئۆتۆمۆبیلەکانیشەوە، سەردانیماڵەکەشی بکات.

یەکێک لەو تەڵەزگانەی کە دەبێت خۆمانی لێبپارێزین بریتیە لە وەرگرتنی ئەم تێزانە بەشێوەیەکی ڕەها. ئەوەی لێرەدا دەمانەوێت تیشکی بخەینە سەر دەسەڵاتی ئینتەرنێتە لە فراوانکردنی ڕووبەری دەرکەوتنی خودێک کە خودگەرایی خۆی وەک میکانیزمێکی کارا بۆ چاودێریکردنی دیموکراسی و نوخبەی دەسەڵات بەکاردەهێنێت؛ میکانیزمێک کە بە پلەی یەکەم بایەخ بە بابەتە گشتییەکان دەدات و گوزارشت لە هەڵوێستە زاتییەکانی خۆی لەسەر هەر یەکێک لەو بابەتانە دەکات. بەڵام ئایا ئەمە

مانای ئەوەیە کە ئینتەرنێت دەرگا لەسەر چەندین ئاستی نزم لە «مومارەسە» کردنی خوددا ناکاتەوە؟ ئایا ئینتەرنێت هەلومەرجی سوککردنی خود ئامادەناکات؟ ئایا تاکەکانی کۆمەڵگەیەک توانایی ئەوەیان نییە کە ئینتەرنێت بکەن بە ڕووبەری شتە هەرە «شەخسی»یەکانی کەسێک یان خێزانێک، بەڕادەیەک کە کەسێک دەچێتە ئاودەست و وێنەی خۆیدەگرێت و دەیخاتە سەر فەیسبوک و دەنوسێت: من ئێستا لە ئاودەستم؟ ئایا ئەم جۆرە ڕەفتارانە لەگەڵ ئینتەرنێت و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا نامانبەنەوە سەر ئیشکالیەتی بێهەڵوێستی و بێبەهاکردنی گرفتە سیاسییە باڵاکان و چاودێریکردنی دیموکراسی و نوخبەی دەسەڵات؟.

ئێمە بەسەلماندن وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانە دەدەینەوە، بۆیە خوێنەر دەخەینە بەردەم مەترسی وەرگرتنی شتەکان بەشێوەیەکی ڕەها. ڕاستە ئینتەرنێت چانسی دەرکەوتن بەم جۆرە ئەکتەرە کۆمەڵایەتییانە دەدات، بەڵام گرەوی ئێمە لەسەر ئەم جۆرە ئەکتەرانە نییە، بەڵکو لەسەر ئەوانەیە کە خودگەرایی خۆیان وەک تاقیکردنەوە دەبینن و بە وشیارییەوە خودی خۆیان بەدیدەهێن. گرەوەی ئێمە لەسەر ئەو ئەکتەرانەیە کە سنوری شتە تایبەتەکان لە سنوری شتە گشتییەکان جیادەکەنەوە و هەوڵدەدەن خودگەرایی خۆیان وەک «ئیلتیزام» لەبەرامبەر چاودێریکردنی ڕەوتی ڕوداوەکاندا وێنابکەن. گرەوی ئێمە لەسەر ئەم خودە بەرپرسیار و وشیارانەیە نەک ئەوانەی کە ئینتەرنێت تەنها وەک ئەلبومی وێنەی سەروپێ و کفتەی ئامادەکراو لە لایەن خێزانەکانیانەوە دەبینن.

## • بنەمای خوارەوەی کۆمەڵگە

ئینتەرنێت، وەک ڕوداوێکی مەزنی مێژوویی، پێش هەرشتێک بریتیە لە چەندین تۆڕی گفتوگۆی بەیەکداچوو، ئاوێزان، یەکتربڕ یان یەکترتەواوکەر و بەپێی چەندین لۆژیکی تایبەت بە خۆیان دەڕژێنە نێو یەکترییەوە یاخود لە یەکتری جیادەبنەوە، بەبێئەوەی بتوانرێت بڕیاری پێشوەخت لەسەر ئاراستەکانیان بدرێت. لێرەوە تێکەڵبوونی سنوورەکان دەبێت بە پراکتیکێکی ڕۆژانە.

بەهەرەمەندی یەکەم لە تێکەڵبوونی سنوورەکان خوارەوەی کۆمەڵگەیە، کە لەڕێگای بەکارهێنانی بلۆگ و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی وەک فەیسبوک و تویتەرەوە دەتوانێت گروپی پاڵەپەستۆ و ڕەخنەگرتن و هەڵسەنگاندنی سەرەوەی کۆمەڵگە، بەتایبەتی نوخبەی دەسەڵات، دروستبکات. ڕاستە خوارەوەی کۆمەڵگە، بەشێوەیەکی گشتی، خاوەنی زمانێکی ئەدەبی دەربڕین نییە و ڕەنگە لە ڕستەیەکدا چەند هەڵەیەک بکات؛ بەڵام لەپێناوی ئامانجێکی دیاریکراودا، بەئاسانی دەتوانێت «تەعبئەی» گروپێک بکات، بەئاسانی دەتوانێت لەسەر ڕوداوەکانی ڕۆژ قسەبکات و لەڕێگای شێوازە هەمە جۆرەکانی دەربڕینەوە (نوکتە، وێنە، کۆمێنت، ڤیدیۆ، تابلۆ، ڕەمز) بۆچونی خۆی بگەیەنێت.

کەمنین ئەو ڕۆژنامە، گۆڤار، تەلەفزیۆن و ڕادیۆیانەی کە ناچارن گفتوگۆ جۆراوجۆرەکانی سەر ئینتەرنێتی خوارەوەی کۆمەڵگە بکەن بە بابەتی ریپۆرتاژ و بەرنامەکانیان. کەمنین ئەو کەسایەتیانەی کە لە سەرەوەی کۆمەڵگەدا دەژین و بۆ پەیوەندی بەردەوام لەگەڵ خوارەوەی کۆمەڵگەدا ناچارن دابەزنە نێو «جەنگەڵستانی» تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە! هەر ئەم دەرئەنجامەی بەریەککەوتنەی سەرەوە و

خوارەوەی کۆمەڵگەشە کە شتێک بەناوی «کۆنترۆڵ»ەوە دروستدەبێت. گەر تا دوێنێی پێش سەرهەڵدانی ئینتەرنێت، دەسەڵاتی کۆنترۆڵ بەتەنها لەدەستی سەرەوەی کۆمەڵگەدا بووبێت، لە چرکەساتی ئینتەرنێتدا ئەم هاوکێشەیە دەگۆڕێت و کۆنترۆڵ بەسەر سەرەوە و خوارەوەی کۆمەڵگەدا دابەشدەبێت؛ بەو مانایەی کە چەند سەرەوە، لەڕێگای دەزگا جۆراوجۆرەکانییەوە، هەوڵی کۆنترۆڵکردنی خوارەوە بدات، هێندەش خوارەوە، لەڕێگای میکانیزمە تازەکانی ئینتەرنێتەوە، دەتوانێت بەشێکی زۆری پراکتیکەکانی نەک هەر دیموکراسی بەڵکو تەواوی سەرەوەی کۆمەڵگە بخاتە ژێر کۆنترۆڵەوە.

ئەم چوارچێوە سیاسییانەی کۆنترۆڵی ئامادەکراو لەلایەن ئینتەرنێتەوە، کۆمەڵگەی دیموکراتیک، بە خوار و سەرەوە، ناچاربە «پرۆسێسێک» دەکات کە دەکرێت بە شوشەیی ناویبەرین. واتە ئیتر شتەکان (سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، ئاینی، ئەخلاقی،...) ناچارن بە خۆڕووتکردنەوە، بە خۆ سەلماندن، بە خۆ نمایشکردن، بە دروتسکردنی چوارچێوی شوشەیی بۆ ئەوەی هەموو کەس بتوانێت بە ئاسانی بیانبینێت. کۆمەڵگەی کۆنترۆڵ (بێگومان بەم مانایە) ئیتر کۆتایی بە بێمنەتی، بەهەمیشەیی، بە بەڵگەنەویست، بە یەکلایی بوونەوەکان دێنێت و هەموو شتەکان دەخاتە ژێر پرسیارەوە. وەزیرێک هەر بە دەستنیشانکردنی وەک وەزیر ئیتر ئەو ئەکتەرە بێمنەتە نییە کە لە باڵەخانەکانەوە تەماشای خوارەوە بکات، ئەندامێکی پەرلەمانی هەڵبژێردراو ئیتر ئەو ئەکتەرە نییە کە وابزانێت یارییەکە کۆتاییهاتووە، بەپێچەوانەوە، چرکەی دەستنیشانکردن یان هەڵبژاردن سەرەتای مێژوویەکی دیکەیە لە گومان، لە چاودێری، لە ڕەخنە و لە هەڵسەنگاندن.

ئەمەش وا لەو ئەکتەرە دەکات کە تێبگات لەوەی هەمیشە لە هەوڵی تاقیکردنەوەدایە و کۆنترۆڵێکی بەردەوامی بەسەرەوەیە!.

- **بنەمای خێڵە نوێیەکان**

بەپێچەوانەی «خێڵە» کلاسیکییە مێژووییەکانەوە کە چوارچێوەی سروشتی بوون و لەنێو فاکتە سروشتییەکاندا خۆیان بیناکردووە، «خێڵە» نوێیەکانی سەر ئینتەرنێت چوارچێوەی خوازراو و هەڵبژێردراون. ڕەنگە تەنها ڕەگەزێک کە ئەم دوو چوارچێوەیە پێکەوە کۆبکاتەوە ناوی «خێڵ»بێت، گەرنا لەهیچ هەلومەرجێکدا سنورەکانیان تێکەڵبەیەکتری نابن. گەر لە چوارچێوەی یەکەمیاندا کەسی تاک، خواستەکانی، خەونەکانی، بەرژەوەندییەکانی هیچ بەهایەکیان نەبێت، لە چوارچێوەی دووهەمدا هاوکێشەکە بە سەد و هەشتا پلە دەگۆڕێت و کەسی تاک خۆی دەبێت بە ناوەندی بیناکەری خێڵ. گەر لە چوارچێوەی یەکەمدا پەیوەندی نێوان تاکەکان تا ئاستی خۆ فیداکردن لەپێناوی خێڵدا بەرزببێتەوە، لە چوارچێوەی دووهەمدا ئەم پەیوەندییە، لە بارودۆخە ئاساییەکاندا، لە ئاستێکی لاوازدایە، بەو مانایەی کە ناگاتە ئاستی خوێنبەخشین و خۆفیداکردن.

بەشێکی زۆری خێڵە نوێیەکانی سەر ئینتەرنێت دەرەنجامی «ئەنتەراکسیۆن»ی نێوان شوناسی تاکەکان، چێژەکانیان، بەرژەوەندییەکانیان، چالاکی و خەونەکانیانە. ئەوان لەڕێگای چوارچێوەی گشتی خێڵە نوێیەکانەوە گوزارشت لە خۆیاندەکەن و بەشێوەیەکی دەستەجەمعی هەڵوێستیان لەسەر شتەکان دەردەبڕن. جومگەیەکی تازەی ئەم خێڵە نوێیانە بریتیە لەوەی کە ڕووتکردنەوەی «فەردانییەتی» تاکەکان دەبێت بە هۆکاری بیناکردنی ئەنتەر «تەبەعیەت»ێکی خوازرای

کۆی ئەندامان. واتە «تەبەعیەت» بۆ خێڵ دەستنیشانی «فەردانییەتی» تاکەکان ناکات، بەڵکو «فەردانییەتی» تاکەکان ئەنتەر «تەبەعیەت» دەتنیشاندەکات!.

لە بارودۆخە نائاساییەکاندا دەکرێت خێڵە نوێیەکانی سەر ئینتەرنێت، بە جۆرێک لە جۆرەکان، بەرزببنەوە بۆ ئاستی خێڵە کلاسیکییەکان، بەتایبەتی لە بواری قوربانیداندا. دەکرێت لێرەدا ئاماژە بە شۆڕشەکانی دنیای عەرەبی بکەین. خێڵە نوێیەکانی سەر فەیسبوک، لە تونس و میسردا ڕۆڵی کارایان بینی و قوربانییەکانیان گەشتە ئاستی خوێن و گیان بەخشین. لەم جۆرە بارودۆخانەدا پەیوەندی نێوان تاکەکان دنیای ڤیرتیوڵ بەجێدەهێڵێت و بەگۆشت و ئێسقانەوە پێدەنێتە نێو دنیای واقیعەوە. هەروەها دنیای پاش شۆڕشەکانی تونس و میسر، کە دیسان بارودۆخی نائاساییین، ئەم خێڵانە، کە بەردەوام چاودێریی دیموکراسی دەکەن، ناچار دەکات بەوەی کە بۆ ماوەیەکی درێژتر دنیای ڤیرتیوڵ و دنیای واقیع پێکەوەگرێبدەن.

پاش ئەم لێکدانەوە و ڕاڤەکردنانە، ئێمە تێدەگەین لەوەی کە هەوڵدان بۆ کورتکردنەوەی ئینتەرنێت و وێناکردنی تەنها وەک کەرەسەیەکی میدیایی کارێکی هەڵەیە و دوورە لە واقیعەوە. بەڵێ ئینتەرنێت میدیایە و ڕۆڵی میدیا دەبینێت، ئەمە بەڵگەنەویستە. بەڵام لەپەنای میدیابوونیدا، ئینتەرنێت هەم فۆرمی سیاسییە و هەم فۆرمی کۆمەڵایەتیشە. ئینتەرنێت بەتەنها پردی گواستنەوەی زانیارییەکان نییە، بەڵکو بیناکاری ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیشە. ئینتەرنێت هەزاران هەزار خێزان دروستدەکات، هەروەک هەزاران هەزار خێزانیش هەڵدەوەشێنێتەوە، هەزاران هەزار مرۆڤ دەخاتە سەر کار، هەروەک هەزاران هەزار مرۆڤیش لە کار دووردەخاتەوە.

ئینتەرنێت دەسەڵاتی هەڵسەنگاندنی نەک هەر سەرۆکێک، وەزیرێک، دەزگایەک، ڕێکخراوێک، کەسایەتییەک بە هاوڵاتیان دەبەخشێت، بەڵکو دەسەڵاتی هەڵسەنگاندنی کتێبێک یان دیسکێکیشی پێدەبەخشێت (بەشێکی زۆری ئەو مەگازانەی کە کتێب و دیسک دەفرۆشن، داوا لە کڕیارەکان دەکەن کە لەڕێگای ئینتەرنێتەوە، ئاستی باشی یان خراپی کتێب و دیسکی کڕراو دیاریبکەن، ئەمەش بەپێی ئەو سیستەمی نمرەبەخشینە لە یەکەوە تا پێنج کە خۆیان لەسەر سایتەکانیان دایانناوە). واتە ئینتەرنێت وادەکات کە کردەی هەڵسەنگاندن دابەزێتە هەموو پانتاییەکانەوە و بەتەنها لە ئاستی «ماکرۆ»دا کارنەکات. ڕەنگە ئەمەش یەکێکبێت لەو چانسە باشانەی کە لەبەردەم دیموکراسی کوردیدایە؛ چانسی بەکارهێنانی ئینتەرنێت بۆ چاودێریکردن و هەڵسەنگاندن و کۆنترۆڵکردنی دیموکراسی کوردی لەلایەن کۆمەڵگەی مەدەنییەوە، لەپێناوی پاراستنی لەهەر گریمانەیەکی لادان و ڕیزپەڕی.

# (٣)
# گروپی تایبەتمەندە جیاوازەکان

زانسته کۆمەڵایەتییەکـان، بەدرێژایـی مێژوویـان، بەشـداری زیندوویانکردووه له هاوڕێیەتیکردن و پاشان پارێزگاریکردن له چوارچێوه گشـتییەکانی دیموکراسـیدا. یەکێـک لەو بەشـداریکردنانه بـریتیه له بەرهەمهێنـانی توێژێـک له تایبەتمەنـدی لەو ڕووبەره جیـاوازانەدا که دیموکراسی و پرۆژه فراوانەکانی له خۆدەگرن.

تایبەتمەنـدەکان دەکرێـت سۆسـیۆلۆگ، ئەنترۆپۆلـۆگ، پۆلیتۆلـۆگ، ئیتنۆلۆگ، سایکۆلۆگ یاخود ئیکۆنۆمیست بـن. کـاری سـەرەکییان بـریتیه له بەرهەمهێنانی مەعریفەیەکی بابەتییـانه لەسـەر هەمـوو ئەو شـتانەی که پەیوەنـدی به کـۆمەڵگەوه هەیه، لەسـەروی هەمووشـیانەوه دیموکراسـی و پـراکتیکه ڕۆژانەکـانی. ئامـادەیی ئەم تـوێژه له کۆمەڵگەیەکدا، زیـاتر له ئامــادەیی ئەو «جیهــازه» دەچێــت که له هەر ڕووبەرێکـدا لادانێکـی تۆمـارکرد، بەشـێوەیەکی ئۆتۆمـاتیکی هـاواری لێهەڵدەسـتێت و لەڕێگـای زەنگلێـدانەوه هەمــوو لایەک ئاگاداردەکـاتەوه لەوەی که مەترسـییەک بەڕێوەیه.

دەکرێت لێرەدا نمونە بە تایبەتمەندەکانی ڕووبەری مافەکانی مرۆڤ بێنینەوە. ئەم تایبەتمەندانە جیاوازن لە چالاکوانانی بواری مافەکانی مرۆڤ کە هەڵگری ئایدۆلۆژیای تایبەتن. تایبەتمەندەکان، لەدەرەوەی هەموو ئایدۆلۆژیاکان، ئاینەکان، ئەخلاقەکان چاودێری کۆی ئەو داتایانە دەکەن کە پەیوەندییان بە مافەکانی مرۆڤەوە هەیە و لە هەر جێگایەکدا کە لادانی مەترسیدار تێبینیکرا، زەنگ لێدەدەن و هەموو لایەک ئاگاداردەکەنەوە. زەنگلێدانی ئەم تایبەتمەدانە لەلایەن هەموانەوە بە هەند وەردەگیرێت و وەک کاڵای جەنگی بۆچونەکان، جەنگی ئایدۆلۆژیاکان مەمەڵەی لەگەڵدا ناکرێت.

کاتێک کە تایبەتمەندەکانی ڕوبەری ئابووری، نمرەی وڵاتێکی وەک فەرەنسا لە «A A A» وە، کە بەرزترین نمرەی ئابوورییە، دادەبەزێنن بۆ «A A +»، کە کەمترە لە یەکەم، ڕاستەوخۆ و تەواوی نوخبەی سیاسی و ئابووری فەرەنسی دەکەونە خۆیان و هەستبەوەدەکەن کە وڵاتەکەیان بە قەیرانێکی سەختی ئابووریدا تێدەپەڕێت و لە دەرئەنجامدا سەدان پرۆژە، بە هەزاران ملیار ئیرۆوە دەخەنە کار بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ «A A A» و لە شوناسی «A A +» وڵات ڕزگاربکەن.

ئامادەیی تایبەتمەندەکان لە ڕووبەرە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوورییەکاندا چەندین چوارچێوەی هەیە. بەشێک لەوان وەک تاک کاردەکەن و لە ڕێگای میکانیزمە تایبەتەکانی خۆیانەوە و لەسەر ئاستی تاک چاودێری بواری تایبەتمەندی خۆیان دەکەن و لە کات و شوێنی پێویستدا بەدەنگدێن. بەشێکی دیکەیان لە ڕێکخراوە ناحکومیەکاندا کاردەکەن و خاوەنی پۆستی هەمیشەیین و ژیانیان لەسەر کردەی چاودێریکردن بەڕێوە دەچێت. هەروەها بەشێکی دیکەشیان لەلایەن

دەزگاکـانی دەسـەڵاتەوە دامەزراون و بەشـێوەیەکی بابەتییـانە و دوور لە بڕیـاری ئەخلاقـی و سیاسـی، مەعـریفە لەسـەر واقیعـی شـتەکان بەرهەمدەهێنن. بێگومان ئەکتەرەکانی دەسـەڵات، زیـاتر لە هەر کەسـێک و بۆ بەڕێوەبردن و حکومەتداری، پێویستیان بەم جۆرە لە مەرعریفە هەیە.

بەپێچەوانەی بزوتنەوە کۆمەڵایەتییەکانەوە کە لە کۆمەڵگەی کوردیـدا، بـا لە ئاسـتێکی نزمیشـدابێت، ئامادەییـان هەیە و کـارایی بەسـەر ڕەوتـی ڕوداوەکـانەوە دادەنـێن، تایبەتمەنـدەکان نەک هەر کـارایی، بەڵکـو ئامادەییشیان نییە. ئەم ونبـوونە دوو هۆکـاری سـەرەکی هەیە: یەکەمیـان پەیوەنـدی بە زانکۆکـانەوە هەیە و دووهەمیشـیان پەیوەنـدی بە سروشـتی کۆمەڵگەی کوردیەوە هەیە.

گەر تایبەتەمەنـــدەکان پـــێش هەر شـــتێک بەرهەمـــی زانســـتە کۆمەڵایەتییەکان بن، گەر بوونی زانسـتە کۆمەڵایەتییەکـان و بەهێزبوونیـان مەرجی سـەرەکی لەدایکبـوونی تایبەتمەنـدەکان بێـت، بەئاسـانی دەتـوانین لەوە تێـبگەین کە بـۆچی ڕووبەرەکـانی کـۆمەڵگەی ئـێمە خـاڵین لە تایبەتەمەندەکان. زانکۆکانی کوردستان، بەداخەوە تائێستاش سـەرچاوەی بەرهەمهێنـانی مەعـریفە لەسـەر دنیـای کـوردی نییە. گەر ئـێمە بەدوای مەعریفە لەسەر دنیای کوردیدا بگەڕێین، ئەو شـوێنەی کە دەبێـت خۆمـانی پێوە ماندوونەکەین زانکۆکانی کوردستانن. ئەم مەعریفەیە، کە بێگومـان لە ئاسـتێکی سـەرەتاییدایە، لە دەرەوەی زانکۆکـان دەسـتدەکەوێت، لەنێـو کتێبی ئەو کەسانەدایە کە لە زانکۆکـانی کوردسـتاندا جێگایـان نـابێتەوە. بێهـودەنییە کە بەدرێژایـی مێـژووی کـۆمەڵگەی ئـێمە، جەنگمـان هەیە، سیاسـیمان هەیە، پێشـمەرگەمان هەیە، ڕۆژنامەنوسـمان هەیە، خێڵمـان

هەیە، سەرمایەمان هەیە، بەڵام هەموو مێژووی ئێمە خاڵییە لە سۆسیۆلۆگ، ئەنترۆپۆلۆگ، پۆلیتۆلۆگ، سایکۆلۆگ، ئیتنۆلۆگ.

لە زانکۆکانی ئێمەدا، حیزب بەرهەمدێت، شانە دروستدەکرێت، بانگەواز بۆ لای خوا دەکرێت، خێزان بەرهەمدێت، بەڵام مەعریفە ئەو گۆدۆیەیە کە هەرگیز ناگات. لەهەلومەرجێکی ئاوادا، دروستبوونی تایبەتمەندی دانپیادانراو، دەبێت بە بەشێک لە موستەحیل. ئەوەی جێگای پێکەنینە، سەرئاوکەوتنی چەند وردە خوێنەوارێکە کە خۆیان ناونیشانی تەیبەتمەندیان لە خۆیان ناوە و جار جار لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا چەند بابەتێکی بێ سەروبەر و دوور لە هەموو بنەما زانستییەکان بڵاودەکەنەوە و پێیانوایە ئیتر گەیشتون بە لوتکە! ئەم وردە خوێنەوارانە، لەرێگای ئەم فێڵکردنەوە، هەوڵدەدەن ببن بە سێبەر و واقیعی ناشرین وەک ئەوەی کە هەیە بشارنەوە، بەڵام بێگومان لەم کارەیاندا سەرکەوتووناىن، چونکە خودی پرۆژەکەیان کارتۆنییە و تەمەنی درێژنابێت.

لەلایەکی دیکەوە، نەزۆکی زانکۆکانی ئێمە لە بەرامبەر بەرهەمهێنانی تایبەتمەندا، وایکردووە کە کۆمەڵگەی کوردی نامۆبێت بە کولتووری تایبەتمەندبوون و گوێگرتن لە تێبینی و بۆچوونی تایبەتمەندەکان و تەنانەت هەستکردن بە «زەرورەتی» بوونی تایبەتمەند. لەوەزارەتی پەروەردەی فەرەنسیدا سەدان تایبەتمەندی گەورەی دانپیادانراو، دوور لە هەر ئینتیمایەکی سیاسی، کاردەکەن و مەعریفە لەسەر کێڵگەی پەروەردە لە فەرەنسادا بەرهەمدەهێنن. لە کوردستانی ئێمەدا پۆستی تایبەتمەند بۆ ئەو کەسانە دانراوە کە خەباتی هاوبەشیان لەگەڵ دەسەڵاتدارەکاندا هەیە!

تایبەتمەندەکانی ژیانی کۆمەڵگەیی بریتینین لە سۆسیۆلۆگەکان، بەڵکو کەسە نزیکەکانی دەسەڵاتدار، هتد.

من پێموایە ئەمە چەند پەیوەندی بە هەستنەکردن بە «زەرورەتی» تایبەتمەندەوە هەیە، هێندەش پەیوەندی بە ترس لە ئامادەیی «تایبەتمەند»ەوە هەیە. لەبەر ئەوەی کە کۆمەڵگەی ئێمە ئەم کولتوورەی نەبووە، بەردەوام لێی دەترسێت و لە خەیاڵدانی خۆیدا چەندین وێنەی ترسناکی بۆ دروستکردووە: وێنەی ناپاکی، فێڵڵێکردن، ڕوتکردنەوە، پاشقوڵلێگرتن، ناوزڕاندن، سیخوڕی، هتد. لێرەوە هەر ئامادەبوونێکی تایبەتمەند وەک هەڕەشەیەکی هەمیشەیی تەماشادەکرێت.

بەشێوەیەکی گشتی، ئامادەیی بەهێزی تایبەتمەندەکان لەهەر کۆمەڵگەیەکدا چانسی بەهێزکردن و پاشان پارێزگاریکردن لە دیموکراسی بەرزدەکاتەوە. بەپێچەوانەشەوە، کۆمەڵگەی بێ تایبەتمەند، هەمیشە نزیکە لە مەترسی پەڕینەوە بەرەو دیکتاتۆریەت، تۆتالیتاریزم، ستەمکاری، گەندەڵی.

لە جیهانی مۆدێرندا دیموکراسی «هەڵبژاردن» و «نوێنەرایەتیکردن» لێوانلێوە لە بەرهەمهێنانی لێکدژی، بەریکەوتن و گرژبوونەوەی گروپ و ئەکتەرە کۆمەڵایەتییەکان. یەکێک لەو لێکدژیانەی کە دەکرێت لێرەدا ئاماژەی پێبدەین بریتیە لەو «ئەنتەراکسیۆن[٣٧]»ە ئاڵۆزەی کە لەنێوان دەنگدانی ئینتیما و دەنگدانی حکومەتداریداهەیە[٣٨]. دەنگدانی ئینتیما وەک ئەوەی کە لە میسری موحەمەد مورسیدا ڕویدا، نیشانەی ئینتیمایە بۆ گروپێکی سیاسی کە لەڕێگای بنەمای یەکسانی هاوڵاتیانەوە خۆی بەدیدەهێنێت و پاش بردنەوە ئەم ئینتیمایە دەیەوێت بەسەر تەواوی لاشەی کۆمەڵگەدا بکشێت، بەجۆرێک کە شەرعیەتی هەڵبژاردن بکات بە چەکی نەک هەر هەژمون بەسەر کۆی گروپە جیاوازە کۆمەڵایەتی و

---

[٣٧] ئەنتەراکسیۆن بریتیە لە ئەکسیۆنی بەرهەمهێنراوی خواستراو یان نەخواستراوی (موتەبادەل/ ریسیپرۆک)ی چەند ئەکتەرێک لە دۆخێک یان سیستەمێکدا کە دواتر کاریگەری بەسەر ئەو دۆخە یان ئەو سیستەمەوە دادەنێت.
ئەنتەراکسیۆنیسم ئەو قوتابخانەیەیە کە هەموو ئەو "موقارەبانە" لە خۆ دەگرێت کە کاردەکەن لەسەر ئەنتەراکسیۆنی نێوان ئەکتەر و ستراکتۆرەکان. ئەکتەر وەک ڕەگەزی ڕاڤەکردنی سەرەکی فۆرمەکان و ستراکتۆریش وەک چوارچێوەی دۆخ و سیستەمەکان. ئەنتەراکسیۆنیسمی سامبۆلیک ئەو ڕێبازەیە کە ڕوناکی دەخاتە سەر کۆی ئەو مانایانەی کە ئەکتەرێکی کۆمەڵایەتیبەشێوەیەکی عەفەوی بە ئەنتەراکسیۆنەکانی دەدات.

[38] Pierre Rosanvallon, *Lacontre-démocratie*, Seuil, 2006, p.293.

سیاسییەکاندا، بەڵکو لەڕێگای «پرۆسێسێکی[٣٩]» نەرمەوە خودی ئەو جیاوازییانە بسڕێتەوە. لەبەرامبەر دەنگدانی ئینتیمادا شتێکی دیکەمان هەیە کە پێیدەوترێت دەنگدانی حکومەتداری، کە بریتیە لە دابەشکردنی بەڕێوەبردن لەگەڵ هەموو ئەو «توانایانەی» کە دەکرێت لەدەرەوەی گروپی سیاسی دەنگپێدراوەوە ئامادەبن. پەیوەندی نێوان ئەم دوو چوارچێوەیە هەڵگری سروشتێکی ئاڵۆزە و گەر بەوردی مامەڵەی لەگەڵدا نەکرێت، گریمانەی سەرهەڵدانی لێکدژی و پاشان تەقینەوە لە هەر چرکەیەکدا ئامادەیە. پیەر ڕۆزانڤالۆن، پرۆفیسۆر لە کۆلێژی دو فرانس، ئەم پەیوەندییە بە تۆڕی نێوان «ژمارە» و «عەقڵ» ناودەبات. ئەوانەی کە گروپێک دەگەیەننە دەسەڵات لە ڕێگای ژمارەی دەنگەکانیانەوە لەلایەک و ئەو گروپەش کە گەشتوەتە دەسەڵات و دەیەوێت بەشێوەیەکی «عەقلانییانە» جیاوازەییەکان، بەرژەوەندییەکان و خەونەکانی کۆمەڵگەیەک بەڕێوەببات لەلایەکی دیکەوە. چەند کۆمەڵگەیەک لەسەر مافە جیهانییەکانی کەسی تاک خۆی بینابکات و چەند کەسی تاک بکات بە سەنتەری پرۆژەکانی، هێندەش گریمانەی نزیکبوونەوە لە بنەمای عەقڵ و دابەشکردنی دەسەڵات و دووڕکەوتنەوە لە سروشتی زەبروزەنگ و مۆنۆپۆڵکردن دووردەکەوێتەوە.

---

[٣٩] پرۆسێس کە بە فەرەنسی دەبێت بە پرۆسێسیوس: بەڕەچەڵەک وشەیەکی لاتینییە و مانای «هەنگاونان بۆ پێشەوە» دەگەیەنێت. مانا سۆسیۆلۆژیەکەی بریتیە لە: کۆی ئەو چالاکییانەی کە پێکەوە گرێدراون و لە جوڵانەوەیەکی ڕێکخراودا دەرهاویشتە سەرەتاییەکان وەردەگێڕنە سەر دەرهاویشتەی ئەنجامگیر. دوژمنی سەرەکی چەمکی پرۆسێس بریتیە لە ستراکتۆری چەقبەستوو.

ڕاپەڕینەکانی ڕۆژهەڵاتی سەدەی دوو هەزار (تونس، میسر، یەمەن، لیبیا، سوریا، بەحرەین و تەنانەت عێراقیش)، سەرلەنوێ دەمانبەنەوە سەر پرسی دیموکراسی نوێنەرایەتیکردن. بۆ تاوتوێکردنی و تێگەشتن لەم پرسە، دوو «ستراکتۆر[٤٠]» ڕووبەڕوومان‌دەبنەوە؟ ستراکتۆری گەل و ستراکتۆری کۆمەڵگە. دیموکراسی نوێنەرایەتیکردن بریتیە لە فەرمانرەوایی زۆرینەیەک کە گەل دەنگی پێدەدات و دەیگەیەنێتە دەسەڵات، بۆنمونە میسری موحەمەد مورسی و تونسی ڕاشید غەنوشی و مەغریبی عەبدولئیلا بنکیران و تورکیای ڕەجەب تەیب ئەردۆگان. بەڵام ئایا ئەوەندە بەسە کە گەلێک دەنگ بە حیزبێک بدات و سەروەری پێببەخشێت و بیگەیەنێتە دەسەڵات؟ ئایا ستراکتۆرەکەی دی، کۆمەڵگە کە ڕووبەری بەریەککەوتنی سەدان هەلومەرجی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەخلاقی و ئاینی جیاوازە، بە لۆژیکی گەلی فەرمانڕەوا، فەرمانڕەوایەتی گەل دەبرێت بەڕێوە؟ گرفتەکان لێرەوە دەستپێدەکەن. ئەو مەودایەی کە لەنێوان نوێنەرایەتیکردنی سیاسی و واقیعی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەیەکدا هەیە، بەبێ ئامادەکردنی بەرنامەی تایبەت و فراوانی کارکردن لەسەری، لە کۆتاییدا دەتوانێت لەیەککاتدا سەری حیزبی دەسەڵاتدار و خودی کۆمەڵگەش بخوات، باشترین نمونەیەکیش کە ئێستا لە بەردەستماندایە میسرە. ئەوەی کە ڕووبەڕووی ترازیدیا دەبێتەوە بە تەنیا برایانی موسوڵمان نین، بەڵکو تەواوی کۆمەڵگەی میسریشە.

---

[٤٠] پێشتر پێناسەی چەمکی ستراکتۆرمان کرد.

بێگومان ئەم گرفتانە بەتەنها لەمێژووی کۆمەڵگەکانی ڕۆژهەڵات نەئالاون. لەچرکەساتی شۆڕشە گەورەکانی وەک بەریتانی و فەرەنسی و ئەمەریکیشدا، کۆمەڵگەکان ڕووبەڕووی هەمان تایپ لە گرفت بوونەتەوە و هەمان پرسیاریان لە دیموکراسی نوێنەرایەتیکردن کردووە. کاتێک دیموکراسی نوێنەرایەتیکردن شەرعیەت بە گروپێکی براوە دەبەخشێت، چۆن و کەی و لەکوێدا و بەچ ڕێگایەک مافە جیهانییەکانی مرۆڤ لە دەرئەنجامە سەلبییەکانی دیموکراسی نوێنەرایەتیکردن بپارێزین؟ ئەمە هەمان پرسیاری کۆمەڵگەی فەرەنسی و بەریتانی و ئەمەریکیش بوو لە کات و ساتی خۆیدا. ئەوەی ئەم کۆمەڵگە مۆدێرنانەی لە کارەساتەکانی دیموکراسی نوێنەرایەتیکردن ڕزگاکرد بریتیبوو لە دروستکردنی سیاسەتی بەڕێوەبردنی «موتەوازیعانە» کە چەند گروپە براوەکان خۆیان بە شەرعی دەزانی، هێندەش دەگەڕانەوە بۆ گوێگرتن لەو گروپ و ئەکتەرە کۆمەڵایەتی و سیاسییانەی کە تەواوی کۆمەڵگەکانیان پێکدەهێنن. ئەوان وشیاربوون بەوەی کە سەرۆکی دەمارگیر، خۆبەزلزان، خۆلێباییبوو، گوێنەگر، سەرۆکی پیرۆز کە بەچاوی سوکەوە تەماشای کۆمەڵگە و جیاوازییەکانی دەکات، نەک هەر تەمەنی درێژنابێت، بەڵکو مەترسیشە بەسەر ئاشتی کۆمەڵایەتییەوە. ئەوان وشیاربوون بەوەی کە هەر چرکەساتێک بنەمای «عەقڵ» بخەنە نێوان دوو کەوانەوە و بەتەنها باس لە چیرۆکی ژمارە و شەرعیەتی ژمارەی دەنگدەرەکانیان بکەن، ئیدی خۆشیان و کۆمەڵگەکانیان بەرەو قوڵایی دۆزەخ دەبەن! تەنها لە ساتەوەختێکی مێژووییدا کە کۆمەڵگەی ئەڵمانی پشت لەم بنەمایە دەکات، ئەدۆلف هیتلەر دەگاتە دەسەڵات، تۆتالیتاریزم باڵ بەسەر تەواوی کۆمەڵگەدا دەکێشێت، نەک بەتەنها ئەورووپا بەڵکو جیهان ڕووبەڕووی

قەیرانێکی مەزن دەبێتەوە، جەنگی دووەمی جیهانی دروستدەبێت، پێنج ملیۆن جولەکە دەسوتێرنێن، چەندین ملیۆن کەس لە بەرەکانی جەنگدا دەکوژرێن و تارماییەکی ڕەش نەک بەتەنها ئەڵمانیا بەڵکو جیهانی چلەکان دادەپۆشێت.

پاش ئەم ئەزمونە، کۆمەڵگە دیموکراتیکەکانی ڕۆژئاوا، چ لەسەر ئاستی گروپ و چ لەسەر ئاستی تاک، هەمیشە لەسەرپێن بۆئەوەی لە ڕێگای سەدان میکانیزمی بەرەنگارییەوە، جارێکی دی هەلومەرجی دروستبوونەوەی هیتلەرێکی دیکە دروستنەکەنەوە. یەکێک لەو میکانیزمە سەرەکییانە بریتیە لە بەشداریکردنی ڕاستەوخۆی هاوڵاتیان لە دروستکردنی بڕیارە سیاسییەکاندا. واتە هاوڵاتی چیتر ئەو کەسە نییە کە چوار ساڵ جارێک دەچێتە بەردەم سندوقێکی دەنگدان و پاشان تا چوار ساڵی دیکە دەستەوستان ڕادەوەستێت و ئیفلیجانە تەماشای ڕووداوەکان دەکات. نەخێر، هاوڵاتی پێش دەنگدان و پاش دەنگدانیش کەسێکی کارایە و لەڕێگای بنەمای «ڕێفلێکسیڤیتێ[٤١]»وە نوخبەی دەسەڵاتدار ناچار

---

[٤١] چەمکی ڕێفلێکسیڤیتێ لای عەرەبەکان بە "ئینعیکاسیەت" باسکراوە. بەڵام من پاش ڕاوێژکردنم لەگەڵ کۆمەڵێک تایبەتمەند لە بواری سۆسیۆلۆژیادا، گەشتوومەتە ئەو قەناعەتەی کە وشەی "ئینعیکاسیەت" لەتوانایدا نییە گوزارشت لە ماناکانی ڕیفلێکسیڤیتێ بکات و دواتر خوێنەری کورد خۆی سەربەستە لە بەکارهێنانی زاراوە فەرەنسی و عەرەبییەکەدا.

ڕێفلێکسیڤیتێ بریتیە لەو مەسافەیەی کە ئەکتەرێک لە نێوان خۆی و چالاکییەکانیدا دروستی دەکات بە مەبەستی لێرامان و وردکردنەوە و ڕاڤەکردنیان تا بتوانێت تێبگات لەوەی کە ئەنجامی داوە. گەڕانەوەی ئەکتەری کۆمەڵایەتییە بۆ سەر هەموو ئەو

بە ملدان بە خواستەکانی و گەڕانەوە بۆ بۆچونەکانی لە ساتەوەختی دروستکردنی بڕیارە سیاسییەکاندا دەکات.

ئەم فۆرمە لە دیموکراسی پێیدەوترێت: دیموکراسی بەشداریکردن. لە دیموکراسی بەشداریکردندا، هاوڵاتی بەتەنها مافی دەنگدانی نییە، بەڵکو مافی چاودێریکردن و تەنانەت مافی سزادانیشی هەیە. هاوڵاتی کە دەنگ بە پرۆژەیەک دەدات، لەهەمانکاتدا دەیەوێت چاودێری جێبەجێکردنیشی بکات. بەبێ چاودێری بەردەوامی هاوڵاتی، کێ دەتوانێت گرەنتی ئەوەبکات کە ناپاکیکردن لە دەنگەکان، لە پرۆژەکان و لە بەرژەوەندییەکان نەبێت بە دیاردەیەکی ئاسایی ژیانی سیاسی!.

لە دنیای نوێدا، هیچ دەسەڵاتێک ناتوانێت باس لە شەرعیبوونی خۆیبکات بەبێ ئەوەی هەمیشە لەسەرێ بێت بۆ تاقیکردنەوە،

---

هەلومەرج و مێژووە خودی و بابەتیانەی کە گوتار و ڕەفتارەکانی تیادا بەرهەم دەهێنێت. گەڕانەوە بەمەبەستی ڕاڤەکردن و تێگەشتن.

ممارەسەکردنی ڕیفلێکسیڤیتێ ڕێگا بە هەر ئەکتەرێکی کۆمەڵایەتی دەدات کە ببێت بە ڕەخنەگری یەکەم و ڕاڤەکاری یەکەمی چالاکییەکانی ڕۆژانەی خۆی. گەورە سۆسیۆلۆگی بەریتانی ئەنتۆنین گیدانس ڕێفلێکسیڤیتێی سەردەمی مۆدێرنیتێ وەک گرەنتی بەرهەمهێنانەوەی سیستەم و کارایی دانانی فیکر بەسەر کردەوەدا دادەنێت.

لە کۆمەڵگەیەکدا کە ئەکتەرە کۆمەڵایەتییەکان ممارەسەی ئەم بنەمایە ناکەن و کردە و چالاکی و گوتارەکانی ڕۆژانەیان ناخەنە ژێر پرسیارەوە و خۆیان تەسلیم بە زنجیرەیەک لە یەقین و شتە دەقگرتووەکان دەکەن، ئومێدی گۆڕان و بەرەوپێشەوەچوون تەواو لاواز دەبێت. کۆمەڵگەی زیندوو ئەو کۆمەڵگەیە یە کە دەستبەردای ڕێفلێکسیڤیتێ نابێت.

چاودێریکردن، هەڵسەنگاندن، پشکنین و سەلماندن[٤٢]. هەر دەسەڵاتێک کوردی بێت یان عەرەبی، ئیسلامی بێت یان عەلمانی، ڕۆژهەڵاتی بێت یان ڕۆژئاوایی، چەپ بێت یان ڕاست، گەر ئەم بنەمایە قبووڵنەکات، مافی ئەوەی نییە بانگەشەی شەرعیبوونی خۆی بکات.

42 Pierre Rosanvallon, *opus citatum*, 2006, p.302.

چی وادەکات کە هاوڵاتیان تا ئاستێکی ترسناک ڕقیان لە سیاسییەکان بێت؟، چی وادەکات کە یادەوەری هاوڵاتیان هەمیشە سەرگەرمی کێشانی ناشیرینترین وێنەی سیاسییەکان بێت؟، چی وادەکات لەوەی کە هاوڵاتیان گومانیان لە هەموو شتێکی ئەم نوخبەیە بێت؟، گومان لە خانوەکانیان، لە ئۆتۆمۆبیلەکانیان، لە پارێزەرەکانیان، لە بەڕێوەبردنیان، لە گەشتەکانیان، لە پێکەنینەکانیان، لە گریانیان، تەنانەت لە ژیانی شەخسیشیان؟، کامانەن ئەو میکانیزمانەی کە دەکرێت گەمارۆی ئەم بێ‌متمانەییە بدەن و مەودای نێوان کۆمەڵگە و نوخبەی سیاسی کەمبکەنەوە؟، چۆن و بەچ ڕێگایەک کۆمەڵگە دەتوانێت دەسەڵاتی نوخبەی سیاسی سنوورداربکات و ڕێگاکانی لادان «ئینحراف»ی لێبگرێت؟، لە ئامادەنەبوونی ئەم میکانیزمانەدا، ئایا تاچەند «ڕقێکی ڕەشی کۆمەڵگەیی» لە دیموکراسی وەک گریمانەیەکی بەهێز هەلومەرجی بابەتییانەی لەدایکبوون و گەشەکردنی ئامادەدەکرێت؟.

# La société noire

## Dr. Adel Bakawan

Chargé de cours à l'Université d'Evry, département d'Administration Economique et Sociale.
Docteur en sociologie, auteur d'une thèse sur l'islamisme en mutation à l'Ecole des Haute Etudes en Sciences sociales de Paris.
Chercheur associé à l'Institut Français d'Etudes Anatoliennes.

2013
Paris






www:endeshe.org
andesha.library@yahoo.com
http//:www.facebook.com/Andeshalib
07501026400

سلێمانی ـ شەقامی مەولەوی
تەلاری بازرگانی سیوانی نوێ
نهۆمی چوارەم
ناوەندی رۆشنبیری ئەندێشە